


govaryidea@gmail.com

## گۆڤارێکی فکریی فەلسەفییە و گرنگی بە لێکۆلینەوە و وەرگێران دەدات دەومانگ جارێک دەردەچێت ژمارە(٣٨) نیسانی٢٠١٣ ساڵی نۆیەم

**خاوەنی ئیمتیاز: دەزگای والا**

**سەرنوسەر: ئەنوەر حسێن**

**a.bazgr@gmail.com**

**٠٧٧٠١٥٣٥٠٢٩**

**جێگری سەرنوسەر: لوقمان رەئوف**

**lukmanraoof@yahoo.com**

**٠٧٧٠١٣٦٩٧٩٢**

**بەرێوەبەری نوسین: هاشم ئەمین**

**دیزاینەر: روناک رەسوڵپور**

**تایپ و هەڵەچن: نەورۆز فوئاد، باوان عومەر، شاد محەمەد**

**بەرێوەبەری پەیجی فەیسبوک: باوان عومەر، سەروەت تەوفیق**

**تیراژ:١٠٠٠ دانە**

**نرخ: ٤٠٠٠ دینار**

**چاپ: چاپخانەی کارۆ**




**کارل یاسپرس**
**وەرگێڕانی لەفارسییەوە: سەرهەنگ عەبدولڕەحمان**

## ژیاننامەی نیچە






توێژینەوە لە فەلسەفەو هزری نیچە تەنیا ئەو ساتە دەگات بە تیگەشتنی راستەقینە کە هاوکات بەرِوونی لە ژیانەکەشی بدوێ، لەم بارەیەوە بە کورتی لەژیانەکەشی دەدوێن.

رووداوە گرنگەکانی ژیانی :- نیچە لەناوچەی راکن هاتە دنیاوە. هەندێ لە باپیرانی چ لە بنەماڵەی باوکی و چ دایکی قەشە بوون. پێنج ساڵ بوو کە باوکی کۆچی دوایی کرد، دایکی شوێنی خۆی گواستەوە بۆ نورنبێرگ، لەوێ لەنێو کۆمەڵێك لە ژنانی بنەماڵەکەیدا لەگەڵ خوشکەکەیدا کەدووساڵ لەوبچوك تربوو گەورەبوو. لەتەمەنی دەساڵیدا لەنورنبێرگ چووە قوتابخانەی (رێنومایی) لە تەمەنی چواردە ساڵیدا(١٨٥٨)لە قوتابخانەی شەوانە رۆژی شولپفورتا وەرگیراو شوێنی نیشتەجێ بوون و خۆراکیشی بۆ دابین کرا.

شولپفورتا قوتابخانەیەکی ئابرومەندبوو کەبەوە بەناوبانگ بوو ئەمینداری بەرجەستەی زانستی مرۆیی زۆر بوو. لەتەمەنی بیست ساڵیدا(١٨٦٤)نیچە خوێندنی قۆناغی زانکۆیی دەست پێکرد.دوو نیوە ساڵ لەشاری بۆن بوو پەیوەست بوو بەئەنجومەنی خوێندکارانی زانکۆیی فرانکۆنیاوە، بەلاّم لەساڵی(١٨٦٥)دا لەو ئەنجومەنە هاتە دەرەوە، چونکە لەگەڵ کارکردن بە ئامانجەکانی نەدەگونجا. پاشان لەگەڵ مامۆستاکەی «ریچل» لە (بۆن)وە چوو بۆ لایپتزیك ولەوێ لەگەڵ

هاوڕێکەی (ئیروین ڕۆد)دا بوونە درەوشاوەترین قوتابی ئەو مامۆستا فیلۆلۆژییە و نیچە هەنگاوی نا بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی فیلۆلۆژی و نوسینەکانی لەوبوارەدا بلاوکردەوەو تەنانەت لەپێش وەرگرتنی پلەی دکتۆرا بەتکای ڕیچل پێشنیاری مامۆستایی بۆکرد لە»بازل» .ریچل بۆبازلی نوسیبوو زۆربوون ئەولاوانەی کەلەماوەی ئەم (٣٩) ساڵەدا بەچاوی خۆم بینەری گەشەکردن و گەورەبوونیان بووم، بەڵام هەرگیز لاوێکم نەبینیوە، کەهێندە خێراو بو تەمەنە کەمەوە وەکو ئەم نیچەیە....بگات بەئەزموون پێشبینی ئەکەم کە ئەگەر عومری درێژ بێت (إنشا و الله) کەوادەبێ سەرەنجام بگاتە ڕیزی پێشەوەی فیلۆلۆگەکانی ئەڵمانیا،ئێستا تەمەنی بیست وچوار ساڵە.بەهێز و پتەو و تەندروست و جەستەو ڕۆحی دلێرە. لێرە لەلایپزیك بت و پەرستگەی هەموو فیلۆلۆگە لاوەکانە، دەڵێ کەسێکی وا بەم شێوە عەجیبە،ئەرێ ئەو بەڕاستی سەیرەو لەهەمانەکاتدا خۆشەویست وبێ فیز .... لەهەر کارێکدا کەبڕیار بەو بدرێ سەرکەوتوو دەبێ.

لەو کاتەدا دوو دەیە تادەرکەوتنی شێتێتی تێدا مابوو.نیچە لەساڵی (١٨٦٩) تا(١٨٧٩) لەزانکۆی بازل مامۆستا بوو،وەکو. بورکهارت شەش سەعاتیش لەدامەزراوەی پەروەردەیی وانەی دەوتەوە، دەرگای ماڵی ڕێزداران ومتمانە پێکراوان بەڕوویدا ئاوەلا بوو، لەگەڵ زانایانی دیارو بەناوبانگی بورکهارت لەوانە : باخوفن،هویزلر، ڕۆتیمایر تارادەیەك نزیك بووەو لەگەڵیدا بوو بەهاوماڵ. لەلوتکەی تێکەلاویدا بوو لەگەڵ خەڵکیدا و لەراستیشدا لوتکەی سەرانسەری ژیانیشی، کە تا کۆتایی تەمەنیشی هەر بەو سیفەتەمایەوە .دیدارەکانی لەگەڵ ریشاردو کۆزیما ڤاگنەر لەنێوان ساڵانی(١٨٦٩و ١٨٧٢)دالە تریبیشنی نزیك لۆسرن بوو، پەرتوکێکی نووسی و بلاوی کردەوە بەناوی (لەدایك بوونی تراژیدیا) و پاش ئەوە لەکۆری فیلۆلۆگەکان کرایە دەرەوە و بەچوونە پێش پەیوەست بووبەڤۆن و ویلامۆوویتس .هەربۆیە خوێندکارە فیلۆلۆژیەکانی زانکۆی (بازل) یش وردە وردە لێی دور کەوتنەوە .لەساڵی (١٨٧٣)دا شالاوەکانی نەخۆشی دەستی پێکرد و ناچاری کرد ساڵی خوێندنی(١٨٧٦-١٨٧٧)مۆڵەت وەربگرێ و بەشێکی گەورەی کاتەکانی لەگەڵ «پۆل رەی» لەماڵی مالویدافۆن مایزنبوگ لەسۆرنتۆ(لەئیتالیا) بەسەربەرێت لەساڵی (١٨٧٩)دا لە تەمەنی سی وپێنج ساڵیدا نیچە بەهۆی نەخۆشیەوە بە ناچاری وازیهێنا.دووەمین دەیەی(١٨٧٩-١٨٨٩) نیچە لەگەڕان بەدوای ئاو و هەوایەکدا کەئارامی بەنەخۆشییە بە ئازارەکەی ببەخشێ لەسەفەر و گەڕاندا بوو لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و بێئەوەی بە

هۆی گۆڕانی وەرزەکانەوە لەهیچ کوێ زیاد لەچەند مانگێ بمێنێتەوە، زیاتر ئەنگادین وکەناری دەریای  ماوەیەك لە ڤینیسیا بوو،سەرەنجام چوو بۆ شاری تۆرینۆ (لەئیتالیا) لەزستاندا زۆربەی کاتی لە شاری نیس و لەهاویندا لەزیلس ماریا بەسەر دەبرد. هەلاتوویەکی ئاوارەبوو کە بەسەرمایەیەکی سنوردارەوە لە ژوورێکی سادەو ساکاردا ژیانی بەسەر دەبرد، رۆژانە بەسەر گەردانی لەکێو دەشتدا دەیگوزەراند کلاوێکی لێوداری لەسەر دەکرد، تا چاوەکانی لەتیشکی خۆر پێ بپارێزێ و رووبەرووی چەندین رێبوار دەبویەوە .

پەرتوکەکانی پێشووی نیچە –تراژیدیای تراژیدیا–و یەکەمین بەشی جەنجالیەکیان وروژاند :ئیتر یا بەسۆزو عیشقی دڵەوە مەقبول بوون،یان رێك وراست ناپەسەند بوون، بەلام نوسینەکانی دواتریشی سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنابوو.ئەو پەرتووکانەشی کەوشەی کورتی تێدابوون تەقریبەن هیچی نەفرۆشراو نیچە کوتە دەوەنی لەبیرچوونەوە .بە هۆی هەندێ مەرجی تایبەت لەگەڵ بلاوکەرەوەکانی پەرتووکەکانیدا توشی کێشەی ئالۆزو سەر ئێشە دەبوو، سەرەنجام هیچ رێگە چارەی نەما جگە لەوەی کە نوسینەکانی لەسەر ئەرکی خۆی بلاو بکاتەوە تەنیا لەدواهەمین مانگەکانی تەندروستی لەرووی نەست و ئاگاییەوە نیچە ناوبانگی دەرکرد کەتەنانەت بۆ ساتێکیش هەرگیز بیری لێ نەکردبوویەو.

نیچە لە کارو پیشەکەی دەرکرابوو، راستەوخۆ وەقفی پەیامی واقیعی کردبوو بەئاشتی لەدەرەوەی دنیا دەژیا،بەلام هەر کەحاڵی رووڵەباشبوون کرد،دڵەکوتێی بوو بۆچ بۆچ ئاووهەوای نوێی پەیوەند بەدونیای واقیعی لەساڵی (١٨٨٣)دا کۆمەڵێك بەرنامەی بووانەو وتاردان لەلایپزیك ئامادەکرد،بەلام کۆڕی زانکۆیی بەهۆی ناوەرۆکی دڵە راوکێ لەسەر نوسینەکانی، ئەو وانەو وتاردانانەی بەناشایستە دەزانی، نیچە هەروا لەدەرەوەی دنیا مایەوە و لەهەمانکاتدا کە بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی، گرژی زیاتر دەگرت .

لە مانگی ژەنیوەری (١٨٨٩)نیچە لەتەمەنی چل وپێنج ساڵیدا، بەهۆی نەخۆشی مێشکەوە لەپێکەوت  و سەرەنجام لەساڵی (١٩٠٠)دا مەرگ کۆتایی بەنەخۆشیە درێژخایەنەکەی هێنا .

## دنیای نیچە

ئەو جیهانەی کەنیچەی تێدا دەژیاو تێیدا بەبینین و فەلسەفەو دەربرینی ئەندێشەکانی خۆیەوە خەریك بوو، سەرەتا لە هەرزەکاریدا لەرێگەی فەرهەنگی ئەڵمانی و قوتابخانەکانی ئەڵمانیاوە کە زانستی مرۆیی تێدا دەخوێندرا بە شاعیرانی ئەڵمانی نەریتی نیشتمانپەروەری ئەو ولاتە ئاشنابوو .

رشتەی خوێندنی نیچە فیلۆلۆژی کلاسیك(یۆنانی وئیتالی) بوو ئەو لەم رێگەیەوە نەك تەنیا دەستی لەسەراپای تەمەنیدا بە ئەندێشە گرانبەهاکانی رۆژگاری کۆن گەیشت بەڵکو لەکاتێکدا کە هێشتا خوێندکاری زانکۆ بوو خۆشبەختانە بە حەقیقەتی واقیعی ئاشنابوو .سیمینارە فیلۆلۆژییە کلاسیکیەکانی ریچل لەبارەی هونەری شیکردنەوەی فەلسەفی نمونەی نەبوو کەسانی جیاوازی بەدەر لەفیلۆلۆگیش لەپزیشکان بەشداریان دەکرد تا (شێواز) فێربن ئەو شارەزایی ودیدەی کە ریچل برەوی پێدەدا لەگەڵ گشت زانستێکدا لەم هونەرەدا بەشداری هەبوو کە واقیعی لەناو واقیعی و حەقیقەت لەساختەیی و ناسینی بە بەڵگە لە گومانی پەتی ودلنیایی بەرچاو لەباوەری زهنی جیا بکاتەوەو جیاوازییان لەنێواندا بکات .

کەسێ دەتوانێ لەپێکهاتەی ناسینی زانستی تێگەیشتنی روون بەدەست بهێنێ، کە بزانێ چ شتێ لە نێوان زانستەکاندا هاوبەشە، لێرەدا بوو نیچە سەرنجی دەدایە سروشتی خودی هەموو لێکۆڵەرێکی زانا: کێشمەکێشی رەخنەی بێ کۆتایی لەگەڵ بیروراکانی خۆیدا،سۆزو رەونەقی سادە و بێ خەوش.....

نیچە لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیەوە تا کۆتایی تەمەنی لە ولاتانی تر بە سەر بردو بیست ساڵی رەبەق ئەڵمانیای لە دەرەوە دەبینی، ئەمەش گۆرانی هێنا بەسەر دنیا بینی ئەودا وەکو ژیان لەسەر سنورەکانی ولاتێك،تێرامانی رەخنەیی ئەوی تیژ تر کرد و بەتایبەتی لەکۆتایی ئەو قۆناغەی کەببوە مەترسی ئاوارەیی لەئەنجامی سەفەرە بەردەوامەکانیدا ئەگەری ئەوەی دایە کەفەرمانی باو و نەریت باشتر دیاری بکات، گۆران بەردەوام هەستەکان دەجولێنێ و توانا بە کەسایەتی دەدات لە ئاسۆیەکدا بژی کەهەمیشە بەرفراوانتر دەبێت وهەر شتێ

که جەوهەری ڕاستەقینەی هەبێت، چونکە هەستی هەر کەسێ بۆ نیشتمانەکەی بە دورکەوتنەوە لێی بە توندی دەگیرێ لەسەر خۆشەویستی بۆ زێدی سەرەکی یان نەفرەت لێی زیاد دەکات.

نیچە تەنانەت کاتێ کە هەرزەکارە خۆی بە فەلسەفەوە خەریك دەکات لە گەنجێتیدا شۆپنهاوەر بە تاکە فەیلەسوفی ڕاستەقینەی دەزانێ و تێگەیشتنە سوننەتیەکانی فەلسەفە لەلانگەو ئەشپیر تایشموله ودورینگ و(ئیدوارد) فۆن هارتمان وەردەگرێ،لەنێو فەیلەسوفە گەورەکاندا تەنیا بەرهەمەکانی ئەفلاتون تارادەیەك بە کۆمەڵ خوێندوەتەوە و پاشان کە لەدیدی فیلۆلۆژی ئەوانە دەخوێنێتەوە (بەوتەی خۆی) دەکەوێتەترسەوە، کە ئەوەی لەبارەی ئەفلاتونەوە دەیزانێ، کەمێکە(نامەی ٢٢ی ئۆکتۆبەری ١٨٨٣بۆ ئۆربك ) جەوهەرو ناوەرۆکی ئەندێشەی فەلسەفی لەخوێندنەوەی ئەم نوسینانە فێر نەبووە، بەڵکو بەپلەی یەکەم لە ورد بوونەوەو چاودێری جیهانی یونانی سەردەمی پێش سوقرات- واتە فەیلەسوفانی پێش سوقرات و لە هەمویان زیاتر تئوگینس (شاعیری پرسەنامەی سەدەی شەشەمی پ.ز) و شاعیرانی تراژیدی نوسی و سەرەنجام (مێژوونوسی گەورەی.. سەدەی پێنجەمی پ.ز) تۆکۆدیدس وردەوردە فەراهەم بوەو گۆشکراوە،نیچە بەهۆی پەیوەندی بەمەسەلەی فیلۆلۆژی ڕوودەکاتە خوێندنەوەی دیوگنس لائرتیوس (بیرەوەری ڕوانینی سەدەی سێ یەمی زایینی)، بەڵام هەرگیز نوسینی فەیلەسوفە گەورەکانی بەتەواوی نەخوێندوەتەوە زیاتر زانیاری خودی لە سەرچاوەی دەستی دووەم وەردەگرێ. لەگەڵ ئەمەشدا لەتوانایدایە بچێتە قولایی پرۆگرامی سەرەکی و ئەوپەری هۆشی هەمیشە وشك، کەبەهۆی سونەت و گێرانەوە بەنەوەکانی دواتر گەیشتوە بە پەیرەو کردن لە سروشتی خۆی،هەموو ساڵێ بۆگەیشتن بەمەسەلەی حەقیقەت و ئەسڵی فەلسەفە سورتر دەبێ .بەشێوازی فەلسەفەگەری خۆی،بە شاعیرانیش هەمان قەدرو ڕێزیان لێ دەگرێ کە بە وان بە مانای تایبەت بە فەیلەسوف ناونراون لەگەنجێتیدا بەخوێندنەوەی هۆلدرلین بەتایبەتی هۆنراوەکانی ئەو و ئۆمپدوکلس وهوپریون سەرمەست دەبێت و پاشان بەخوێندنەوەی مانفرێد نوسینی بایرۆن،لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا دەچێتە ژێر کاریگەری دیستۆفسکی .

پەیوەندیشی لەگەڵ مۆسیقادا تەنانەت لەمەش قوڵتر و ڕیشەدارتر و چارەنوسسازترە .هیچ فەیلەسوفێکی تر ئەمەندە تەواو لەمۆسیقا تێر ئاوو هێندە

شێتی نەبوە .نیچە تەنانەت لەگەنجێتیدا بە مۆسیقا دێتە کەیف و خۆشی ئامادەیە تەمەنی خۆی بکاتە قوربانی مۆسیقای ریتشارد ڤاگنەر .بێ قەیدو مەرج دڵبەندی ڤاگنەرە و لە کۆتایی تەمەنیدا دان بەوەدا دەنێت کە (لەکۆتاییدا من مۆسیقا زانێکی پیرم کە جگەلە سەداو نەوا جێگەی تر مێشکم ئاسودە ناکات ) (نامەی ٢٢ی ژەنیوەری١٨٨٧ بۆگاست )لەساڵی (١٨٨٨)دادڵبەندی بۆ بۆمۆسیقا تەنانەت توند تر دەبێ و دەنوسێ (مۆسیقا ئێستا کۆمەڵێ ئەزموون بەدیاری بۆمن دەهێنێ کەلەڕاستیدا هیچ کاتێ ڕابردوی نییە من دەباتە ئەندێشە و لە خۆییم جیا دەکاتەوە ... و بەمکارە هێزم دەداتێ  لەدوای هەر شەوێ مۆسیقا سپێدەیەك لێورێژ لە تێرامان و ئەندێشەی مەحکەم دێت ژیانی بێ مۆسیقا هەڵەیەکی پەتییە،سەختێ و دژواری یەدورخستنەوەیە)(نامەی ١٥ی ژەنیوەری ١٨٨٨بۆگاست). بەڵام هەمان نیچە بەهەمان گەرم و گوری هەروا رووی لە مۆسیقا وەرگێرا .لەساڵی (١٨٨٦)دەربارەی ساڵانی پاش (١٨٧٦)بەم شێوەیە دەنوسێ (یەکەمین کارم ئەمەبوو کە بە ڕاشکاوی و بە شێوەیەکی ئوسوڵی خۆم لە هەموو مۆسیقایەکی ڕۆمانتیکی بێ بەش بکەم –واتە ئەو هونەرەی کەپرە لە گومان و پرە لە نواندن و پرە لە گەرم و گورێ کە هێز و شادمانی لە ڕۆح هەڵدەگرێ و جۆرەها حەسرەتێ نادیار و شەهوەت دەوروژێنێ هەمیشە تا ئەمرۆ ئامۆژگاری من بۆهەمووئەو کەسانەی کە پیاوانە پێ لەسەر پاکیزەیی ڕۆح و دەرون دادەگرن ئەمە بووە، کە (بەئاگابن لە مۆسیقا) داوەریەکانی نیچە دەربارەی مۆسیقا،هاولایەنە لەگەڵ ئەو نەریتە کۆنەی دژی مۆسیقایە لەفەلسەفەدا .دەنوسێ: (لە مۆسیقادا هیچ دەنگێ نییە توانای دەربرینی کەیف وبێئاگایی ڕۆحی هەبێ،مۆسیقا دەیەوێ حاڵەتە دەرونیەکانی فاوست و هاملێت و مانفێرد بەر جەستە بکات،بەڵام لەم کارەدا ڕوچح وەلادەنێ و تەنیا حاڵەتە شۆکەکان دەگوازێتەوە) دیسانەوە دەنوسێ شاعیر بالاترە لە مۆسیقا زان،چونکە خیتابەکەی بۆ سەرجەم ئادەمیزادەو لەم ڕووەوە خواستی لەو بالاتری هەیە لە خواستەکانی بیرمەند تەنانەت لەویش بالاترە :بیرمەند تازەترین پشوی هێزی کەسی ڕاستەوخۆ بە شێوەی ناوەند دەخوازێ،ئێمە نەچێژ وەرگرتن و خۆشی بەڵکو بە شەرێکی پێویست واز بە سەرجەم شۆفێرەکانی خودی میحوەرەکە دەهێنین نیچە لەو باوەڕەدایە کە (گەشەی خەوش دارو پر کەم و کوری و تەنانەت موتەعەسیبانە هێزی تێگەیشتن و لاوازی و دان بە خۆدا گرتن بۆ پارێز لە ڕق و کینەو بوختان،لەوانەیە بەرهەمی بێ تەرتیبی بەناوبانگە

بۆ مۆسیقا )مۆسیقا (مەترسیدارە ) (ئارەزووی بۆگەندەڵی و گومرایی و بەرپا کردنی مەرجەکانی مەسیحی .....هاوکات لەناو چوونی پاکیزەیی ڕۆح وئاژاوەی خەیاڵی چینی دڵ) نیچە ڕاستەوخۆ سەرنج کێش وشکست خواردوی مۆسیقایە ....تەواوی دەزگای عەسەبی –وتەنانەت گەوهەری ناخی – ئە و بە ڕادەیەك خاوەنی چۆنیەتی مۆسیقایە کە ئەوی داماوو بێچارە کردوە، بەڵام مۆسیقا لە هەمان کاتدا ملۆزمی فەلسەفەکەیەتی،بیر کردنەوەی ئەو چەند فەلسەفی تر بێ چۆنیەتی مۆسیقا لەودا کەم دەبێتەوە نەك تەنیا فراییندە فکریەکانی بەڵکو ئەزمونە عیرفانیەکانی لەوجودیشدا بەدەر لە مۆسیقاو دژی مۆسیقایە،نیچە ئەو کەرەستەیەی کەدەیەوێ لەفەلسەفەکەیدا بە کاری هێنا بە شێوەی تایبەتی خۆی لە سەرچاوەی ترەوە وەری دەگرێ ماوەك بەر لەوە ڕێزێکی زۆر لەچەند نوسەرێکی فەرەنسایی –لاروشفوکو، فونتیل،شامفور،،لەسەرووی هەموویانەوە،مۆنتی پاسکال و ئیستاندال –دەگرێ توێژینەوەی دەروناسی بۆ ئەو دەبێتە وەسیلەی فەلسەفەگەری بەڵام نەك شیکردنەوەی بەرهەمی دەرون ناسی ئەزمونی کە لەسەر پایەی(عیللەت و مەعلول )دەرواتە پێش، بەڵکو شیکردنەوە لەسەر بنەمای دەروناسی کۆمەڵایەتی ومێژوویی کەسود لە Verstehen (ناخ تێگەشتن )وەردەگرێ.

هیچ شتێلە دنیادا لای نیچە خاوەنی قەدرو گرنگی گەورە پیاوان نیە کە هەندێ جار دەیگەیاندنە ئاستی خودایەك وهەندێ جار تا ئاستی شەیتان دەیهێنانە خوار .نیچە گەورەیی بێ چەندو چوون و بێ دوودڵی لە گۆتەو ناپلیۆن و هراکلیتۆسدا دەبینێ.سوقرات و ئەفلاتون و پاسکالیش بە گەورە پیاو دەزانێ، بەڵام هێندە بە گومانەوە کە دەبێ ئەوان وابەستە بەمەی کە لە چ کۆمەڵە مەرجێکدا خۆیان دەر بخەن،لە لایەنی جیاوازە هەڵیان بسەنگێنێ .پۆڵس قەدیس و ڕۆسۆ و تەقریبەن لۆتەریش بۆ هەمیشە ڕەتدەکاتەوە،بە ڕاستگۆیی و بێگەردیە وە ستایشی تۆکۆدیدس وماکیاڤیلی دەکات .

نیچە کاتێ دەگاتە قوڵترین ئاستی ئاگایی مێژوویی کە پەیوەندیەك دەبینێ لەنێوان بیر کردنەوەو چارەنوسی لەلایەك وە لەلایەکی ترەوە گەورەپیاوان کە هەمان کێشەو دڵنیگەرانی ئەویان هەبووە و لە گەڵیدا لە قەڵەمرەو مەعنەوییەتدا دەژیان. دەنوسێ: (لەخۆبایی بوونم بۆ ڕەچەڵەکمە...ئەو ژینگەیەی کەلێی دەژیم هەمان ئەو ژینگەیە کە زەردەشت وموساو موحەمەدو عیساو ئەفلاتون و برۆتوس وئەسپینوزاو میرابۆی هەژاند....) (کاتێك کەباس لە ئەفلاتون و

پاسكال و سپينۆزاو گۆتە دەكەم،دەزانم كە خوێنی ئەوان لە دەمارە كانمدا بە تەوژمە )نيچە هەروا لە باو باپيرانی (هراكليتوس وئەميدوكلس وئەسپينوزاو گۆتەی)دەدوێ.

نيگاری نيچە: راپۆرتی هاورۆژگارانی نيچە راستەوخۆ نيگاری ئەو دووچاری خوارو خێچی دەكەن يا لە ديد گايەكی نەشياوەوە دەروانن ئەو هاوشێوەكانی نێوان ئەو ئامانجەكان يا دژە ئامانجەكانی سەردەم دەدۆزنەوە،ياخود لە بارەيە وە بە پێوانەی دەم هەڵبەس داوەری دەكەن و وەك بڵێ لە ئاوێنەی شكاودا ببينن .وێنە ئەو ئامانجەی كە خوشكەكەی لێی دەروانێ بەو هەموو جوانی و شكۆەوە هەمان چارەنوس كە لەواقيعەوە دورە كە نيگاری واقيع بينانە تر بەڵام نەشياوو بەپەلەو ترس وروژاندنی لەلايەن هاورێكەی ئاورێك بەدەست دەدات .ئێمە لە هەردووكيان بە تايبەت بە بەڵگەی سەلمێندراوی هەندێ رووداوەكان،سوپاس گوزارين،بەڵام ئەو كەموكوريانەی كەدەيان بينين موشتاقی بيستنی تەنانەت پێش لەپێ كەوتوترين راپۆرتی هەركەسێ دەكات كە نيچەی ديوە يا قسەی لەگەڵدا كردوە . ئەم تاريفە تەواوە، بەڵام سەرگەردانكەرە هەڵبەتە خاڵێكی باشە بۆ دەست پێكردن بەوێناكردنی سيمای نيچە، بەڵام كەموكورتی و ناديارى تێدايە وێنەی تەواوەتی نادا بەدەستەوە.راپۆرتی هاوچەرخەكانی دەبێ لەرێگەی بەراوردكردنی بەڵگە كەسيەتيەكانی (نامەو نوسين وياداشتەكانی خودی نيچە )وە راست بكرێنەوە بەسەرنج دان لەئاوازی فەرامۆش نەكردنی هەرشتێ كەلێی بەجێ ماوە لەم بارەيەوە سەرنج بدرێتە دێری دواهەمين نامەكانی ....تەنانەت ئەمرۆ وێنەی نيچە هێشتا شێوەيەكی بەرجەستە نادات، ئەو بەو وێنانە بەر جەستە دەبێت كە پێناسيان ديار نيە.ويرای ئەمەش ئێمە ئەم پەيامبەرە دەبينين كە بەردەوام بۆ پێشەوە هەنگاو دەنێ چاومان لێيە كەبەرەو لوتكە بەدەست نەگەيشتوەكان بەرز دەبێتەوە،ديسانەوە دێتەوە بەرچاو، چونكە پياوێكە كەسەربەخۆ ژياوە و تواناى تێگەيشتنی ژيانی ناوەوەی خۆی هەبووە.

نيچە لەژيانی ئاساييدا –لەكارو پيشەو كۆمەڵدا –دورەپەرێز بوو نەهاوسەرگيری دەكردو نەقوتابی و پەيرەوانی هەيە هيچ حەوزەيەكی چالاكی لە دونيادا بۆخۆی دروست نەكرد، ناتوانين بڵێن هاوڵاتی چ وڵاتێكە، چونكە لە هيچ شوێنێ جێگير نەبوەو بێ ئامانج لەشوێنێكەوە بۆشوێنێكی تر رۆيشتوە،دەڵێی بەدوای شتێكدا گەراوە كە هەرگيز ناتوانێ پێی بگات ئەم جۆرە(إستپنا)بوونە لەدەرونيدا جێگيربووە شتێكە تايبەتمەندی فەلسەفەكەی نيچەيە .





یەکەمین قەیران کەرووی تێکرد لەساڵی (١٨٦٥)دا لەشاری بۆن بوو گەرچی گرنگیەکەی دیار نەبوو تەنیا گۆڕانی لە شێوەی ژیاندا دروستکرد ئەوی خستەسەر ئەوەی بەهەنگاوی بڕیاردەرانەوە بەو ڕێگەیەدا بڕوات کەچارەنوس بۆی دیاری کردبوو نیچە پەی بەوە برد کەژیانی خوێندکاری وچالاکی هەمەجۆرو ئەندام بوونی لەئەنجومەنی خوێندکاران و کامڵ بوونی لە ڕێگەی ڕاکێشانی زانیاری و ئەگەری ڕێگە دۆزینەوە بۆکاری زانکۆ هەرگیز ئەوی ڕازی نەکرد .ژیان لە دیدی ئەوەوە نەکامەرانی و هەمەڕەنگی بوونە مەسەلەی پەیرەوکردنی بنەمایەکی پێشتر جێگیرکراو وێرای ئەمە سەرنجی دا شێوازێکی لەژیان گرتوەتە بەر کەناتوانرێ ئەو لەگەڵ خواستەکانی ژیانێکی جدیدا بگونجێنێ،یەکەمین جاربوو کە دیدەکانی بەچەشنێکی شایستە ئامانجی خۆی بپێکێ،هەرچەندە تەنانەت بەلای خۆشیەوە ڕوون نەبوو کەچ شتێ بوەتە هۆکاری ئەمەو پێش بینیەکی لەو شێوەی هێناوەتە ئارا، ئەم شەپۆلە بەتەواوی هەست پی نەکرابوو گەرچی ئەمرۆکە لەرێ ی نامەو ڕەفتارەکانی نیچە دیاری دەکرێ ڕێرەوی دواتری ژیانی لەو ساڵەدا وردە وردە ڕۆشن وجێگیر بوو :-بە جۆرێك کەوتە چالاکی کە دواتر لەنێوان گۆڕانکارییە بەردەوام تازە و بەهێزی ئەو لێخورەی کەهەمیشە خوازیاری ئەوەبوو ئاواتەکانی زیاتر بێتە دی وئامانی نەبوو، نیچەی گەیاندە جەوهەرو حەقیقەتی وجود.

مەسەلەکە ئەمەیە کەئایا سەرچاوەی ئەفرێنەری ژیان لایەنگری کەسێکە کەجورئەتی ئەم هەنگاونانە زیادەڕەوەی هەبێ، دەتوانێ زادەی سەلماندنیش بێ-واتە بابەتێکی چاك کەلەبەرامبەر هەرجۆرە پرسیارێکدا بدرەوشێتەوە؟

ئەم بابەت و ڕوانینە جێگرە، بەپێچەوانەی رابردوو، ئیتر لەخوداوە سەرچاوە دەگرێ، نەلەکەسە بەرێزو پیرۆزەکان ونەلەکەسێ (لەسەر سەری من) تەنیا دەبێت لەداهێنانی خودی تاکدا سەرچاوە بدۆزێتەوە. لانی کەم دەبێ ئێستا دەستیاوبێ، بەڵام نەك بەواتەی مەنفی، بەڵکو بەواتەی جێگیر: کارکردن بەماف، لایەنی چاکەو خراپە، ئیتر ئەو خۆی زەلیل بووەو هەست بەرێزگرتن ناکات: ئەو بۆخۆی ڕێزە، چارەنوسی مرۆڤ لەبەردەستی ئەودایە.)

ئەمە بۆخۆی توێژینەوە یاشیکردنەوەی دەرونە کەلەرابردوودا تێرامان بۆ کۆمەڵە سیمایەکی دیاریکراو بەسەر زمانی نیچەوە بووە، وا دەردەکەوێت بەو توێژینەوانەی کەلەگەڵ دوو گۆڕانکاری گەورەی ساڵی ١٨٧٦ و١٨٨٠دا بەیانکراوە، هاولایەن و هاوڕایە.

(١) لەساڵانی پاش ١٨٧٦دا نیچە ڕایدەگەینێ کەلەڕابردودا هەندێ ڕای هونەری لەجۆری میتافیزیکی بەسەر نوسینەکانیدا زاڵبووە، بەڵام ئێستا ئەو باوەڕەی واز لێهێناوە دەڵێ؛ (باوەڕی خورافی بەهۆشیاری) بەڕاست لەقەڵەم دەدەم. (ئێستا بۆیەکەمین جار دەتوانم بەبیروڕایەکی سادە بەژیانی مرۆڤ بگەم.) و لەنامەیەکدا دەنوسێ؛ (ئەمە سەراسیمەسازی هەموو شتێکی ڕاست و سادەیە، ئەمە شەڕکردنە لەگەڵ عەقڵ بەهۆی عەقڵەوە..ئەمە بوو منی نەخۆش و نەخۆشترکرد..ئێستا هەموو ئەوەی لەوەی من نییە، دۆست ودوژمن و داب ونەریت و ئاسودەیی و پەرتوك، هەموو لەخۆم دور دەخەمەوە.) (نامەی ١٥مایسی ١٨٧٨ بۆ ماتیلدە مایر).

لەبنەمادا دیدی نیچە باوەڕی بەمەیە کەتائێستا بەڕاستی خۆی دۆزیوەتەوە، پێشتر دەربارەی فەلسەفە و فەیلەسوفان قسەی دەکرد، وەلێ ئێستا وردە وردە فەلسەفەگەری دەکات. (ئێستا جورئەتی ئەوەم هەیە دوا بە دوای زانست بڕۆم وخۆم ببمە فەیلەسوف. پێشتر فەیلەسوفەکانم دەپەرست). (نامەی حوزەیرانی ١٨٧٨ بۆفۆکس). هەروەها دەڵێ خۆم لەسەدایەك هەنگاو بۆ یۆنانیەکان نزیکتر دەبینم ئێستا کە(خۆم دەژیم لەهەموو وردەکارییەکان و لەبابەتی زانستیشدا لەهەڵداندام، هەروەکو چۆن لەڕابردودا بەتەواوی داناو زاناکانم دەپەرست وبتم بۆ دادەتاشین) (نامەی١٦- ١٨٧٨ بۆ ماتیلدە مایر)

(٢) دووەمین هەنگاو، نیچەی لە (بیابانی بێرهۆت) کردە دەرەوە وگەیاندییە ئەفراندنی ڕوانینێکی جێگرو نوێ و دیارە دەبوایە بەرهەمی قوڵتری هەبێ و لەسەرەتادا لەبواری سروشتیدا ئەو نمونانەی کەڕادەگەیەنرا، نارۆشنترو نادیارتربێ، نیچە لەم بارەیەوە بەئاگاتر دەبێ و زیاتر دەرك بەشتەکان دەکات، شێوەی قبوڵکردنی ئەم فرمانە لەنێوان ساڵانی ١٨٨٠و١٨٨٣دا دەردەکەوێ وهێدی هێدی پەروەردە دەبێ.

لەوچاو پیاخشاندنانەی کەبەسەر دیدەکانی نیچەدا کردمان، سێیەمین قۆناغ لەهەموویان بەرجەستەتر بوو. تەنیا ئەم قۆناغە شێوە فەلسەفەگەری دواتری ئەوی بەتەواوی ڕەسەنایەتی دەرخست، بەڵام لەلایەکی ترەوە هەمان قۆناغیش باسکردنە لەگەورەترین دژواری حەتمی لەئەندیشەی ئەودا..هەڵبەتە پەیوەندی نێوان گشت قۆناغەکان بەرچاو دەکەوێ، چونکە ئەوە دەبێ لەدوای ماوەیەکی درێژ بەکەماڵ بگات، تەنانەت کاتێ کەبەزەحمەت هەستی پێبکرێ، دیسانەوە

هەمیشە وجودی هەیە، وئەوەی پێشتر دەرکەوتوە، پاشان لەبەردەکرێ...

گەر سەرنج بدەینە ئەمانەی باسمانکرد رەگەزێکی جێگر دەبینین کاتێ کەنیچە روانیە رابردو، بەجۆرێکی قەناعەت پێهێنەرانە دەڵێ؛ کەیەکەمین هەوڵەکانی ئەو لەبنەمادا لەگەڵ کۆتایی فەلسەفەکەیدا یەکە، لەساڵی ١٨٨٨دا خۆی کتێبی (لەدایك بوونی تراژیدیا) دەخاتە بەر رەشەبای رەخنە، بەو بەڵگەیەی کە (میتافیزێکی هونەری) و(دڵداری میتافیزیکی) و (رومانیزمی) تێدا دەبینێ، بەراستی لەقەڵەم دەدات. لەگەڵ ئەمەشدا لەجەوهەردا و لەجەستەی لەدایك بوونی سەرلەنوێ دیونوسوس، عونصرێك دیاری دەکات.. لەنوسینەکانی رابردووی خۆیدا هەمان ئەو بزاوتانە دەبینێ.. کەهێشتا پاش چەندین ساڵ دەیهەژێنێ، هەروەها دەنوسێ (کاتێ مەکتوبەکانم دوبارە خوێندەوە..زۆر ماندوو بووم کەبینیم هێشتا خاوەنی گشت ئەو بزاوتە بەهێزانەم فراوانی و چروپری بەدەستهێنابوو..من هەمیشە لەگەڵ بەبەراورد تەرح وبەرنامەی سەرەکیم.. ژیاوم) (نامەی هاوینی ١٨٨٤ بۆ ئاروبك)

لەرووی وێنەشەوە نیچە لەسەرەتای ژیانیدا نەك تەنیا دەیوت کەچی دەیەوێ ببێ، بەڵکو پێشبینی دەکرد کەبەراستی چی دەبێت، تەنانەت لەپێش ساڵی ١٨٧٦، وەکو بڵێی لەپێشەوە هەستی بەکۆتایی کارەکەی خۆی کردبێ، نوسی؛ (تەنیایی ترسناکی دواهەمین فەیلەسوف! سروشت دڵرەقە بەرامبەری و داڵاشەکان بەسەر سەریدا دەسورێنەوە) هەر لەوکاتەدا بوو کە(وشەکانی دواهەمین فەیلەسوف)ی بەسەر خۆیدا دابەش کردو نوسی؛ (من خۆم بەدواهەمین فەیلەسوف دەزانم، چونکە دواهەمین مرۆڤم! هیچ کەس جگە لەخۆم قسەم لەگەڵدا ناکات و هاوارم وەکو هاواری کەسێك لەسەرە مەرگدا دەگات بەگوێم ! تەنیاییم بەهۆی ئێوەوە لەخۆمدا پەنهان دەکەم و بەدرۆوە بەنێو قەرەباڵغی خەڵك رێگە بۆخۆم دەکەمەوە، چونکە دڵم .. ترس و خۆفی تەنیاترین تەنیاییەکان نادرەوشێتەوە و وام لێدەکات هێندە قسەبکەم کەبڵێین دوو نەفەرە.)

سەرەنجامیش لەنوسینەکانی گەنجیەتیدا (١٨٥٨-١٨٦٨) بە ئەوپەری سەرسامیەوە دەیبینن کەئەو تەنانەت لە رۆژگاری فیدراڵیشدا ئەفکارێك دەردەبرێ، کە داوتر دێتە ناو فەلسەفەکەشیەوە.

سەرچاوە: (نیچەو مسیحیت)، کارل یاسپرس، عزت الله فولادوند، إنشارات سخن چاپ أول: ١٣٨٠





# نیچە و فیمینیزمی هاوچەرخ

**نوشین شاهندە**
**لە فارسییەوە: محەمەد کەریم**



بۆچی فیمینیستەکان مەیلیان بەلای فەلسەفەی نیچەدا هەیە، لەکاتێکدا وا بەناوبانگە کە دژی ژنە؟ ئایا دەتوانرێ فەلسەفەی نیچە لە وتە پڕ لەسوکایەتییەکانی دەربارەی ژنان و دژایەتییەکانی بۆ جولانەوەی فیمینیستی ئەوروپای مۆدێرن جیابکرێتەوەو ئەو فەلسەفەیە بەپشتیوانییەك لەفیمینیزمی هاوچەرخ لەقەڵەم بدرێ؟

ئایا فەلسەفەی نیچە دەتوانێت بۆ تیۆری فیمینیستی سوودمەندبێت؟ ئایا فیمینیستەکان دەتوانن سود لەڕەخنەکانی نیچە دەربارەی مێژوو و بیری فەلسەفی بۆ ڕێگرتن لەهاتنەناوەوەی ژنان بۆ ناو ئەو مێژووە، وەربگرن؟ بۆچی فیمینیستەکان مەیلیان بەلای فەلسەفەکەی نیچەدا هەیە، ئەوان چی لەخوێندنەوەی بەرهەمەکانی نیچە و بیروباوەڕەکانی بەدەستدەهێنن، ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە هەوڵدەدەین وەڵامیان بدەینەوە.

بەشێوەیەکی گشتیی فیمینیستەکان، پەیوەندییەکی جۆراوجۆرو گۆڕاویان لەگەڵ فەلسەفەی نیچەدا هەیە، هەندێکیان، دەربارەی سودمەندیی فەلسەفەی نیچە بۆ فیمینیزمی هاوچەرخ قسەدەکەن و هەندێکی تریان قسە لەزیانبەخشیی ئەو فەلسەفەیە دەکەن، دەتوانین بڵێین لێرەشدا، هەروەکو باقیی بوارەکانی دی، هەمان ئەو تەم ومژ و ناکۆکییە بەدیدەکەین کە لەسەراپای وتەکانی نیچەدا بوونیان هەیە و لەڕاستیدا هەمان ئەو تەم ومژەیە کە وێڕای دژوارکردنی تێگەیشتنی ڕاست و دروست لەبیروباوەڕەکانی نیچە، بوەتە هۆی سەرهەڵدانی ڕاڤە و گوزارشتی جیاواز سەبارەت بەبۆچوون و بیروباوەڕەکانی و لەئەنجامیشدا بوەتە هۆی ئەکتیڤی و تازەیی ئەو بیروباوەڕانە. ڕەنگە گرنگترین کاریگەرییەك



که نیچە لەسەر بیری سەدەی بیست و دوای ئەوەش هەیبێ ئەوەبێ، کە نیچە بوو بە ئیلهام بەخشی مامەڵە و بیری نوێ، ئەم قسانە دەربارەی کاریگەریی نیچە لەسەر فیمینیزمی هاوچەرخیش ڕاستن. خودی فیمینیستەکانیش دەربارەی پەیوەندیی نێوان (نیچە و ژن)، لەدەوری ئەو مەسەلەیە کۆبوونەتەوە کە دەبێ چۆن وتەکانی نیچە دەربارەی ژنان و ژنێتی راڤە بکرێن. ئەوەی فیمینیستەکان لەم بارەیەوە بەدییان کردوە، ئەوە روخساری پڕ لە سوکایەتی و گاڵتەجاریی وتەکانی نیچە نییە، بەڵکو ئەوە هەوڵی (ئەو)ە بۆ بەدەستەوەدانی شێوازێکی نوێ لەگوتار و نوسین و فیکر، کە دەتوانێ بۆ فەلسەفەی فیمینیستی زۆر سودمەندبێ، لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین کە ((بەسودترین لایەنی نوسینەکانی نیچە بۆ فۆرمەڵەبوونی فەلسەفەی فیمینیستی، لەهەڵوێستی ڕاشکاوانەی ئەودا نییە دەربارەی ژن، بەڵکو دەبێ لەشێواز و هەوڵی نیچەدا بۆ خستنەڕووی فەلسەفەیەك دەربارەی لەش و ئاشکراکاریی ئەو دەربارەی خوازەکانی گوتەی فەلسەفیی و شێوەی تایبەتی نیچە بۆ هەڵوەشاندنەوەی پێشداوەریی (نێرانە) لەبیروعەقڵی خۆرئاوادا، بدۆزینەوە)) (کیت ێنسل- پیرسون، ١٣٧٥: ص ٢٤٣-٢٤٤).

لەم نوسینەدا، ئێمە دەربارەی هەندێ لەبنەماکانی فەلسەفەی نیچە قسەدەکەین کە فیمینیستەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوەو چەند ڕێگەیەکی بۆ پێشخستنی بزوتنەوەی فیمینیستی لەبەردەمیاندا ئاوەڵاکردووە، بەڵام بەرلەوە ئاماژە بۆ راڤەکانی درێدا و فۆکۆ دەکەین، سەبارەت بەبیروبۆچوون و ئەندێشەکانی نیچە، لەبەرئەوەی ئەم دوانە سەرەتاکانی سوودوەرگرتنی فیمینیزمی هاوچەرخیان لەبیری نیچەدا فەراهەمکردووە.

زەمینە فەلسەفییەکان

زەمینە فەلسەفییەکانی گەشەکردنی ئەو فیمینیزمەی کە کاریگەریی نیچەی لەسەرە، زیاتر قەرزاری ئەو کارانەیە کە فەیلەسوفە فەرەنسییەکان و لەوانیش جاك درێدا- Jaques Derida و میشیل فۆکۆ Michel Foucault (١٩٢٦- ١٩٨٤) سەبارەت بە بەرهەمەکانی نیچە ئەنجامیانداوە، ئەم دوو فەیلەسوفە فەرەنساییە کە دەتوانین بڵێین بیری پۆست بونیادگەریی لەسەردەستی ئەمان فۆرمەڵەبوو، لەپێناوی بیری نیچەدا، تەواوی عەقڵانییەتی

مۆدێرنێتەی خۆرئاوایان خستە ژێر پرسیارەوە، ئەم دوو فەیلەسوفە لەبنچینەوە نکۆڵی لەڕێبازی میتافیزیك لەفیكری خۆرئاواداو ئەو دوالیزمەش دەكەن كە ئەم فیكرە بنیاتی دەنێ، بۆ نمونە درێداش هەروەكو نیچە، هەرجۆرە باوەڕێك بەدژایەتیی بەهاكان رەتدەكاتەوە كە بە(میتافیزیكی ئامادەبوون) ناوی دەبات، بەڕای درێدا بنچینەی میتافیزیكی خۆرئاوا لەسەر ئەو ئەگەرە وەستاوە كە ((مانا، هەمیشە، ئامادەیە و مانەوەی بەنەزانراوی لەبێدەسەڵاتیی ئێمەوە لە دۆزینەوەی رێگەی راست، یان لەناراستیی ئەو ئامرازەوە سەرچاوەی گرتووە كە هەڵمان بژاردوە. درێدا دەڵێت لەمێژووی فەلسەفەی خۆرئاوادا، هەمیشە گریمان لەسەر ئەوەبووە كە مانا لەقسە و عەقڵدا (كە هەردووكیان بە واژەی یۆنانی Logos) دەردەبڕرێن)، ئامادەیە، درێدا ئەم باوەڕی ئامادەبوونی راستەوخۆیەی بەمانای (میتافیزیكی ئامادەبوون) ناوبردوە)) (بابك احمدی، ١٣٨٧: ص ٤٨٣).

بنچینەی میتافیزیك هەمیشە لەسەرچاوەی جیاواز یان لەڕووبەڕووبوونەوەی دوالیزمەوە دەستپێدەكات: بۆ نمونە دنیا لەبەرامبەر رۆژی دواییدا، شەڕ لەبەرامبەر خێردا، درۆ لەبەرامبەر راستیدا، لەش لەبەرامبەر رۆحدا، سروشت لەبەرامبەر فەرهەنگ و دواجار ژن لەبەرامبەر پیاودا.

رەخنەی درێدا، لەمیتافیزیك راست هەمان ئەو رەخنەیەیە كە نیچە لەمیتافیزیكی هەیە، ئەو ئەم بەراوردانەی قبوڵ نییە: ((رەخنەی سەرەتایی درێدا لەمیتافیزیكی خۆرئاوا ئەوەیە كە بیری فەلسەفی زانستی خۆرئاوا هەمیشە زیندانیی فاكتەری دوو جەمسەری بووە كە خۆی دروستیكردون و پاشان وایزانیووە كە لەراستیدا هەن، بیری میتافیزیك هەرگیز نەیتوانیووە خۆی لەبەندیی ئەم زیندانە رزگار بكات)) (بابك احمدی، ١٣٧٠، ص ٢٨٤)، هەڵوەشاندنەوەی درێداش راست بەهەمان مانایە، واتە درێدا بەنیازی هێنانە ژێر پرسیاری مەیلی كۆن و میتافیزیكی فەلسەفەی خۆرئاوایە و بەهاوكاریی رێبازێك كە بەهەڵوەشانەوە ناونراوە، رەخنە لەبنەمای رێبازی میتافیزیكی خۆرئاواو بنچینەی ئەو رێبازە دەگرێت، بەم شێوەیە نیچە بنەمای كارەكەی بۆ درێدا ئامادەكردوە، هەروەكو پێشان بینیمان و لەئایندەشدا دەیبینین، باوەڕ نەبوون بەدژایەتیی بەهاكان كە رووبەڕووبوونەوەی پیاو/ ژن-یش یەكێكە لەوانە، هەروەها رەتكردنەوەی هەموو جۆرە دوالیزمێك و رەخنەگرتنی تەواو لەنەریت و میتافیزیكی فەلسەفی خۆرئاوا، هەموو ئەمانە لەبنەما سەلمێنراوەكانی بیری نیچەن.

جگە لەمەش، بەکارهێنانی چەمکی (جیاوازیی) لەلایەن دریداوە، بەسودوەرگرتن لەبیری نیچە، یەکێکی تر لەزەمینەکانی سودوەرگرتنی فیمینیستەکانی لەبیروبۆچوونەکانی نیچە فەراهەمکردوە، هەروەکو ئاماژەمان بۆ کرد، نیچە، باوەڕی بەدژایەتی (ناکۆکیی) بەهاکان نییە، ئەوەی بەلای ئەوەوە بوونی هەیە (جیاوازی)یە نەك دژایەتی یان ناکۆکیی و هەموو جۆرە دوالیزمێك لەبیری نیچەدا دەبێت بەسەرنجدان لەم مانایە لێی بکۆڵرێتەوە، هەروەکو دەربارەی ژن و پیاویش، ئەوەی کە بوونی هەیە بریتییە لەجیاوازیی سروشت و دنیای ئەم دوانەو پاشان ئەو جیاوازییانەی کە هەموو شتە تایبەتییەکانی ئەم دوو رەگەزە لەخۆی دەگرێت.

فۆکۆش وەکو دریدای هاوچەرخی، بانگەشەی هەڵوەشاندنەوەی دەربرینە باوەکان دەکات، چ لەزمانی فەلسەفە و زانست و چ لەزمانی رۆژانەدا، بەباوەڕی فۆکۆ ئەم زمانە بەتاڵ نییە، بەڵکو هەڵگری پێشگریمانە و وێناکردنە فەرهەنگییەکانی رێبازێکە.

((شیکردنەوەی قسەی رەخنەگرانە- =Critical Discourse Analgsis CDA کە بەشێوەیەکی رەخنەگرانە زمان دەخوێنێتەوە، شێوازێکە کە لەلایەن میشیل فۆکۆوە دامەزرێنراوە، لەم شێوازەدا باوەڕ وایە کە فاکتەری وەکو پێکهاتەی مێژوویی، پەیوەندییەکانی دەسەڵات لەکۆمەڵدا، بنەما و رەوتە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکان و جیهان بینییەکان، زمان واتە قسە و تێکست فۆرمەڵە دەکەن و لەرێگەی بەکارهێنانی بەردەوامی زمانەوە لەکۆمەڵدا، ئەم پێکهاتە و پەیوەندیی و بنەما و رەوت و جیهان بینیانە، جێگیردەبن و دەمێننەوە، بەمپێیە، لەنێوان ئەو فاکتەرانە و زماندا، پەیوەندییەکی دوو لایەنە و کارلێکردنی بەرامبەر هەیە و ئەمەش راست هەمان ئەو شتەیە کە فیمینیزمی تەحلیلی سودێکی زۆری لێوەرگرتووە، هەروەکو دەبینین، باسە نوێکانیان دەربارەی زمان و باوەڕ بەبوونی شێوازێکی ژنانە لەقسە و گوتار و نووسین و هەتا لەبیرکردنەوەدا، رەخنەی لەزۆر بواری کۆن (سونەتی) گرتووە لەم زەمینانەدا، لەراستیدا، هەمان بیر رێگەی بۆ لێکۆڵینەوەی رەخنەگرە فیمینیستەکان کردەوە لەبواری زمان و فیکردا و بەم شێوەیە لەوە تێگەیشتن کە بابەت یان رەگەزی تێکستی زانستی و فەلسەفی، بابەت یان رەگەزێکی بەتاڵ نییە، بەڵکو بابەتێکی پاتریارك و دەسەڵاتخوازە: هەموو ژنێك بەچاکی دەزانێت کە قسەی حاکم لەرێگەی بەکارهێنانی پەیوەندییە زمانیەکانیەوە ئەو بچوك دەکاتەوەو تارادەی بکەرێکی پەیوەندییە رەگەزییەکان کەمیدەکاتەوە، لەگەڵ رەخنەی

نوێی فیمینیستیدا لەو واقیعە، بەکارهێنانی بەسێکس بووی زمان (Sexist Language) دەستپێدەکات، بەپێی ئەم رەخنەیە، هەموو خوێندنەوەیەکی تێکست و هەموو تێگەیشتنێك لەبەرهەمی هونەریی لەسەر بنەمای (جنس) رەگەز وەستاوە، گوتار و نووسین بێلایەن نین و بەردەوام هەڵوێستی (جنسی) خۆیان دەردەبرن، کەواتە دەتوانرێ بنەمای مانایی تێکست تێکبشکێنرێ کە لەسەر جیاوازیی رەگەز وەستاوە، بەڵام هەمیشە دەیەوێ نکۆڵیی لەم جیاوازییە بکات یان دەیەوێت بنەمای راستەقینەی خۆی بشارێتەوە، ئەم مەسەلەیە، هۆی سەرەکیی لایەنگریی ژمارەیەك لەرەخنەگرە دیارە فیمینیستەکانی وەکو (هیلین سی سو)ە لەتیۆری هەڵوەشانەوە)) (بابك احمدی، ١٣٧٨، صص ١٧٤- ١٧٥)

بەم شێوەیە بیری درێداو فۆکۆ کە بە ئیلهام وەرگرتن لەتێروانینەکانی نیچە، دەربارەی بیری فەلسەفی خۆرئاواو رەخنەلێگرتنی شێوەی گونجاوو جێگیریی خۆیان پەیدا دەکەن، دەبن بەپردێکی پەیوەندیی گرنگ لەنێوان فیمینیزمی فەلسەفی هاوچەرخ و بیری نیچەدا.





## نیچەی فیمینیست

بەلای فەیلەسوفە فیمینیستەکانەوە گەڕان و پشکنین بەناو ئەو میراتەدا گرنگە کە نیچە بۆی بەجێهێشتوون، ئەو فەیلەسوفانە لەنێوان بنەما و خولیای فیمینیستی خۆیان و زۆر بنەمای فەلسەفیی بیری نیچەدا، نزیکییەکی زۆریان بەدیکردوە، بۆ نمونە زۆر لەبنەما گرنگەکانی رەخنە فیمینیستیەکان کە لەمێژووی فەلسەفە گیراون، لەگەڵ رەخنەی نیچەدا لەفەلسەفە یەکسانن، زۆر لەفەیلەسوفە فیمینیستەکان ئەوەیان خستوەتەڕوو، کە فەلسەفە، بەشێوەیەکی باو، لەلایەن پیاوانێکەوە نوسراوە کە بەهای تایبەتی و باڵایان بەشتەکانی تر داوە، ئەو پیاوانە زیهنیان لەسەروو بەدەن و فەرهەنگیان لەسەرو سروشت و عەقڵیان لەسەرو ناعەقڵانییەت و حەقیقەتیان لەسەرو خەیاڵ و خێریان لەسەرو شەڕەوە داناوە و لەوێوە کە ژنان و سیفەتی ژنانە و دایکانەی ژنان هاوشانی بەدەن و سروشت و ناعەقڵانییەت و خەیاڵ و شەڕە، بۆیە رێگە لەژنان گیراوە بۆ چوونە ناو مێژووی فیکر و فەلسەفە و بەمپێیە، لەتێروانینی جدیی و عەقڵانی فەیلەسوفەکاندا- کە دەتوانین بڵێین تەقریبەن هەموویان پیاون- نادیدە گیراون، بەدەربرینێکی دیکە، ئەوەی فەیلەسوفەکان وەکو ئەزمونی مرۆڤایەتیی، خستویانەتەڕوو، لەراستیدا تەنها ئەزمونی پیاوان و هەڵبەتە هی ژمارەیەکی تایبەت لەپیاوان بووە، ئەگەر

چاوێك بەمێژووی بیری فەلسەفی خۆرئاوادا بخشێنین، هەست بەوە دەکەین کە ئەو گۆشەنیگایانەی حیکایەتە فەلسەفییەکان دەریانبریون، هی پیاوانێکی سپی پێست و چینی باڵای کۆمەڵن، لەم رووەوە بەباوەری ڤیمینیستەکان، دەبێ ئەوەی ئەو فەیلەسوفانە دەریانبریوە، جارێکی تر لێبکۆڵرێتەوە. لەبەرئەوەی تەنها بەرووکەش بابەتیبوون دەنوێنن: لەکاتێکدا کە تەنها فەلسەفە و ئەزمون و مێژووی مرۆڤ، هەموو کەسە جیاوازەکان لەخۆ بگرێ، دەتوانین ئومێدەواربین کە ئەو نمونە و ئەزمونانە بۆ سەراپای مرۆڤایەتین.

هەندێکی تر لەفیمینیستەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە کردوە کە بابەتییبوون یان راستیی، لەچەند گۆشەنیگایەکی تایبەتەوە بەدەست دێن و باس لەبارەیانەوە بەجیا لەو کەش وهەوایەی بەسەریاندا زاڵە گومراکەرە، نیچەش لەنووسینەکانیدا هەمان رەخنەی لەبابەتیبوون و راستیی هەیە، نیچە وا قسەدەکات کە هەر راستییەك لەگۆشەنیگایەکی تایبەتییەوە بەرهەمدێت و بەبێ بوونی گۆشەنیگا، تێگەیشتن لەهیچ راستییەك کاریکردە نییە، هەروەکو دەبینین، ئەم گۆشەنیگاکارییەی نیچەش دەتوانێ لەپێناوی پشتیوانیی لەبەهاکانی ژنان و سیفەتە ژنانیەکان سوودی لێوەربگیرێ.

وێرای ئەمەش، نیچە باس لەچەند میتۆدێك دەکات کە بەهۆی بەکەڵکییانەوە چەندین راستیی و بەها و پێگەی تایبەتییان بۆ کۆمەڵێ کەس فراوانکردووەو خۆیان وەکو بەهای باڵاتر نیشانداوە، بۆ نموونە لەکتێبی (ئارکیۆلۆژیای ئاکاردا) نیچە کۆمەڵێ بەهای وەکو ئەو بەهایانەی کە زیهن لەبەدەن بەباڵاتر دەزانن، دەخاتە ژێر پرسیارەوە، لەبەرئەوەی بەباوەری نیچە، ئەو بەهایانە دەبنەهۆی ئەوەی ئێمە دوچاری بێتوانایی و لەئەنجامدا دوچاری گوناهبین، نیچە لەم بەرهەمەیدا و لەتەواوی بەرهەمەکانیشدا، رەخنە لەو مافی پێشخستن و باڵاییە دەگرێ کە بەزیهن نەدراوەو بەبەدەن دراوەو لەوێوە کە ژنان بە بەدەنیان جیادەکرێنەوە، تەئکیدکردنەوەی نیچە لەگرنگی بەدەن، بۆ فەلسەفەی فیمینیستی مایەی ئومێدەوارییە، وەکو لەرەخنەی نیچەدا لەخواستی حەقیقەت یان ئارمانی دورەپەرێزیی هەندێ مەیلی ڤیمینیستی هەیە کە تەئکید لەبەدەن و سەما و چالاکیی و پێکەنین دەکاتەوە، هەروەها ئەو میتۆدانەی کە ئەو بەکاریاندەهێنێ بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە ئەوە نیشان بدات، کە بۆچی بەها بەهەندێ شتی دیکە زیاتر دەدرێ؟ دەتوانێ بۆ هەوڵی فیمینستەکان و فەیلەسوفانی فیمینیست لەلێکۆڵینەوەی ئەو مەسەلەیەدا بەکەڵك بێ کە بۆچی





ژنان و تایبەتمەندیی ژنانە و دایکانەی ژنان لەلایەن فەلسەفەی کۆنەوە بێبەها کراوەو ڕێگە لەچوونە ناوەوەی ژنان بۆ ناو مێژووی بیر گیراوە، بەم پێیە، نیچە بەهێنانە ژێر پرسیاری عەقڵ و ڕۆشنبیریی و ڕاستیی و خێر کۆمەڵێ شتی دیکە دەخاتە ژێر پرسیارەوە کە بۆ بێتوانا لەقەڵەمدانی ژنان و ڕێگرتن لێیان بۆ هاتنە ناو فەلسەفەوە بەکارهێنراون، بۆ نموونە نیچە ئەو شتانەی کە عەقڵ لەناعەقڵانییەت بەباڵاتر دەزانن لەڕێگەی ئەو ئیدعایەوە دەخاتە ژێر پرسیارەوە کە ئەو باڵایی و بەهایەی کە ئێمە بۆ عەقڵمان داناوە، بەرهەمی لۆجیك و عیللەت و مەعلومە، کە خودی ئەم مەسەلەیەش بەرهەمی ڕێزمانە، نیچە باوەڕی وایە کە زمان و وشەکان، واتە ئەو ئامرازەی کە ئێمە بەهۆیانەوە لەبارەی دنیاوە قسەدەکەین، ڕێك ڕەنگدانەوەی جیهان و شتەکانی ناوی نین، بەڵکو بەڕاستی مانایەك دەخوڵقێنن کە ئێمە بەهۆی زمان و وشەکانەوە دەیدەین بەجیهان، هەمان ئەو بیرەی کە زمان دەتوانێت لەجیاتی ئەوەی ڕێك واقیع نیشانبدات، مانا بخوڵقێنێ، هەروەکو دەبینین دەتوانێت بۆ فەلسەفەی فیمینیستی بەسوودبێ.

وێڕای ڕەخنەی نیچە لەعەقڵ، ڕەگەزەکانی ناعەقڵانییەت دەگەڕێنێتەوە بۆ فەلسەفە، نیچە لەپەسەندکردنی دیۆنیزۆس و هەوڵەکانیدا بۆ بەرجەستەکردنی فەلسەفەی دیۆنیزۆسی زۆر بەناوبانگە، دیۆنیزۆس خودای بەرداری و جۆش وخرۆشەو لەوێوە کە بەدەن، جۆش وخرۆشی ناعەقڵانیی تایبەتی ژنانە، دیسان بەهادانان بۆ جۆش وخرۆشی بەدەن، لەلایەن نیچەوە، دەتوانێ ببێتەهۆی بەهادانان بۆ ژنان.

ڕەخنەی نیچە لەدوالیزمی فەلسەفی یان میتافیزیکی- بەشێوەیەکی گشتی- دوایالیزمی جنسی- بەشێوەیەکی تایبەتی- لەڕوانگەی هەندێ لەفیمینیستەکانەوە دەتوانێت بۆ فەلسەفەی فیمینیستی سودمەندبێ، هەرچەندە ژمارەیەك لەفیمینیستەکان باوەڕیان بەدوالیزمی جنسی هەیە، کە نیچە بەتایبەتی سەبارەت بەئەخلاقی خاوەن کۆیلە و کۆیلەکان تەرحی دەکات، لەم ڕووەوە دوالیزمی جنسی نیچە لەگەڵ پرانسیپە فیمینیستیەکاندا بەناکۆك دەبینن.

أ- ڕەتکردنەوەی دوالیزمی سێکسی

نیچە بەڕەتکردنەوەی دوالیزمی کۆسمۆلوجیا و دوالیزمی فەلسەفەی کۆن، لەڕاستیدا دوالیزمی سێکسیش ڕەتدەکاتەوە، هێرشی نیچە بۆ سەر دوالیزم، بەتایبەتی لەکتێبی (ئەو دیوی خێر و شەڕ)دا بەدیدەکرێ، هەرچەندە لەیەکەم

بەرهەمی فەلسەفیدا واتە (لەدایکبوونی تراژیدیی لەرۆحی موزیکا) وە دوالیزمێکی سەرەتایی بەدیدەکرێ، واتە نیچە لەوێدا بەجیاوازیی لەنێوان ڕواڵەت و واقیع قایل دەبێ و ڕواڵەت وەکو ڕوبەڕووبوونەوەی (ئەپۆلۆن- خودای خۆر) لەگەڵ دیڤینزۆس، دەبینێ لەڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ واقیعدا، بۆ نمونە شاد ومانی یۆنانیەکان کاردانەوەیەك بوو لەبەرامبەر ئەو ترسەدا کە ئەوان لەبەرئەوەی تێگەیشتنێکی قووڵیان هەبوو سەبارەت بە (ناکۆکی و یەکەم ئازار لەدڵی یەکەم (یەکتا- وحدانیە)دا (زایش تراژدی، ص ٦) هەیانبوو، یان عەقڵانیەتی نائاسایی ئەوان، کاردانەوەیەك بوو لەبەرامبەر سروشتی نائاسایی ناعەقڵانیاندا.

لەوێوە کە نیچە، باوەڕیوایە سەردەمی بیرکردنەوەی دۆگمایی بەسەرچووە، ڕووبەڕووی دیدگای بیرکردنەوەی دۆگمایانەی فەیلەسوفانی پێش خۆی دەبێتەوەو ڕەخنە لەپێشداوەریی ئەو فەیلەسوفانە دەگرێ، یەکێك لەو پێشداوەریانە، باوەڕکردنە بەناکۆکی بەهاکان:



(بنچینەی ئەم پێشداوەرییە، باوەڕێکە کە دەڵێت هەر شتێك کە (خێر)ێکی بێ مەرجە، دەبێ هاودژێکی هەبێ کە ئەویش (شەڕ)ێکی بێ مەرجە، ئەم باوەڕە ئەو ئەنجامە ناوەکیەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، کە بێغەل وغەش بوونی (خێر) یەعنی ئاوێتەبوونی لەگەڵ (شەڕ)دا، خێر نابوت و ئالودە دەکات، (استنلی ملك دانیل، ١٣٧٩، ص ١٣٣) ئەم دژایەتیە فەلسەفیانە بریتین لەدژایەتی نێوان خێر/ شەڕ، زیهن/ بەدەن، حەقیقەت/ خەیاڵ، بیرکردنەوەی بەئاگا/ بیرکردنەوەی بێئاگا و دواجار پیاو/ ژن، بەڵام نیچە دەربارەی جۆراوجۆریی دوالیزم دووجۆر گومانی هەیە: (چونکە یەکەم دوالیزمی دەتوانرێ سەبارەت بەم مەسەلەیە گومان بکرێ کە ئایا قەت دژایەتیەك هەبووە، و دووەم ئەوەیە کە زیاتر ئەم بەهادانانە ڕەشۆکیانە و دژایەتی بەهاکان، کە ئەوانەی باوەڕیان بەمیتافیزیك هەیە لەزگەی خۆیان لێداوە، جگەلە بەهادانانی ڕواڵەتی مەسەلەکان و گۆشەنیگایەکی سەرپێی شتێکی دیکە نەبن (فراسوی خیرو شر، ص ٣). نیچە لەسەرەتادا گومان دەکات کە ڕەنگە دژایەتی لەمجۆرە هەرگیز وجودیان نەبێ و پاشان گومان دەکات، کە ئەگەر دژایەتی لەمجۆرە هەشبن، ڕەنگە تەنها بەهۆی گۆشەنیگایەکی تایبەتییەوە بایەخیان هەبێ و ئەوانەی پێیان دەوترێ (دژەکان) لەبنچینەدا یەك بن و پێکەوە پەیوەستبن: (زیاتر ئەوەی مایەی بەهاداریی مەسەلەیەکی وا پەسەند کراوە، بریتیە لەو پەیوەندییە بەئەدەبانەیە، کە لەگەڵ



مەسەلە خراپەکاندا هەیە کە بەرواڵەت دژ بەخۆیانەو بەیەکەوە پەیوەستن و بەیەکداچوون، زیاتر لەیەك جەوهەرن، زیاتر! (هەمان سەرچاوە).

رەخنەی نیچە لەبیروبۆچوونی فەیلەسوفە کۆنەکان لەبارەی بیری هەست و نەستەوە کە یەکێکە لەو دوانە دژ بەیەکانە کە تائێستا هەموو فەیلەسوفەکان پشتیان پێبەستووە، بەو بانگەشەیە دەست پێدەکات، کە دەڵێت: (گەورەترین بەشی ئەندێشەی بەئاگا لەوانیش ئەندێشەی فەیلەسوفانە دەبێ وەکو کرداری غەریزی لەقەڵەم بدرێ). هەمان سەرچاوە، ل٣) نیچە لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێت (وردە وردە ئەوە بۆ من ڕونبوەتەوە کە هەر فەلسەفەیەکی گەورە تا ئێستا جگەلە دان پێدانانی تایبەتی نوسەرەکەی و جۆرێ لەیاداشت نووسینی نەویستراو نەزانراو شتێکی دیکە نەبووە) .(هەمان سەرچاوە ل٦) نیچە باوەڕیوایە ئەو سیستمانەی کە فەیلەسوفەکان دایدەنین، دەربری سروشت و خوی ئەوانە.

نیچە، سیستمی فەیلەسوفە بەناوبانگەکان لەچوارچێوەی هەڵسەنگاندنی بەهای ئەخلاقیاندا شیدەکاتەوە و دەڵێت (فەیلەسوفی راستەقینە، هەمیشە قوڵترین (پاڵنەرەکانی) خۆی لەئەندێشەکانیدا پێچەوانە دەکاتەوە) چونکە (زانا سەروەری خوازەو لەو لایەنەوە هەوڵ بۆ فەلسەفە لێدان دەدات). (هەمان سەرچاوە)

هەڵبەتە ئەمە بەو مانایە نییە کە هەموو ئەندێشەیەکی بەئاگا دەتوانێ لەسنوری غەریزەدابێ، چونکە بۆچونێکی لەوجۆرە، نیچە تا ئاستی ماتریالیزم دادەبەزێنێ و ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئەو هەوڵدەدات لەوە ڕادیکاڵانەتر مامەڵە بکات، جگەلەمەش لەوێوە کە نیچە باوەڕی بە (پرانسیپی پەیوەستیی) هەیە، واتە باوەڕی بەوە هەیە کە بەرزترین کاری فیکریی، بەشێوەیەکی تەواو بەنزمترین ڕەفتاری ژیانیەوە پەیوەستە، هەروەها باوەڕی بەوەش هەیە کە هەموو شتێ لەدژەکەی خۆی دروست بێ و دژی ئەو پێشداوەرییەیە، کە هیچ شتێ ناتوانێ لەدژەکەی خۆی دروست بێ، نیچە، لەبواری پەیوەندییە مرۆییەکانیشدا بەبیرێکی لەوجۆرە قایلە، بۆ نمونە (تەئکید لەوە دەکاتەوە کە دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی پەیوەندیی زۆر نزیکیان هەیە و دادپەروەریی و تاوانکاریی دوو ڕووی یەك دراون، هەتا ڕەنگە بەرزترین بەها مەعنەویەکانیش لەقوڵترین بزواندنی سێکسیدا ڕەگ و ریشەیان هەبێ) (استنلی ملك دانیل، ١٣٧٩، ص ١٣) (ئەندێشەی بێئاگا یان غەریزی، بەشێوەیەکی باو، هەمیشە لەگەڵ بەدەندا

بووە، لەکاتێکدا کە ئەندێشەی بەئاگا هەمیشە لەگەڵ ڕۆحدایە، بەڵام نیچەش وەکو دیکارت باوەڕیوایە کە نەفس، ڕۆح یان زیهن لەگەڵ بەدەندا یەك گەوهەریان هەیە، نیچە پێکەوەبوونی نائاگا لەگەڵ بەدەن و بەئاگا لەگەڵ ڕۆحدا ڕەتدەکاتەوە، چونکە هەردووکیان وا دەبینێ کە پەیوەستن بەیەکەوە. نیچە لەم بارەیەوە دەڵێ: (هۆشیاری، دوا قۆناغی کاملبوونی سیستمی بوونەوەرە زیندووەکان و دواجار ناچزترین و لاوازترین بەشی ئەو سیستمە و سەرچاوەی کۆمەڵێ هەڵەی بێشومارە، کە دەبنەهۆی ئەوەی هەموو بوونەوەرێکی زیندو هەموو ئینسانێ زوتر لەوکاتەی کە بریارە و هۆمیرۆس وتەنی (وێرای چارەنوس) لەناو بچێت، ئەگەر شوێنگەی غەریزەکان، کە پارێزەر و پاسەوانە تا ئەو رادەیە لەهۆشیاری بەهێزتر نەبوایە و بەگشتی ڕۆڵی ڕێکخەری نەگێرایە، بێگومان مرۆڤایەتی لەژێر باری بریاری ناعەقڵانی و قسەی بێ ماناو هیچ و پوچی و ساویلکەییدا دەینالاند و بەکورتی هۆشیاری خۆی لەپێدەخست، بەدەربرینێکی دیکە، بەبێ ئەم غەریزانە دەمێك بوو لەناوچوو بووا!) (دانش شاد ص١١)

نیچە، وەکو بونەوەرێکی زیندو لەهۆشیاری دەروانێ کە لەگەشەکردن و پێگەیشتن و جولەدایە: (بەباوەڕی من ئەوە ویژدانی ئاگا و ناوەڕۆك و چەقی قورسایی بوونی ئینسانیی هەر کەسێکە کە فاکتەری بەردەوام و هەمیشەیی و بالاتر و بنچینەیی ئەوکەسە پێکدەهێنێ: ئێمە وەکو شتێکی جێگیر لەهۆشیاری دەڕوانین! گەشەکردن و هەستان و نیشتنەوەی ڕەتدەکەینەوەو وەکو (یەك بوونەوەری زیندوو) لەبەرچاوی دەگرین! مرۆڤ بەزەحمەت لەوەحاڵی بووە کە دەبێ بوونی خۆی لەگەڵ داناییدا ئاوێتە بکات و دانایی لەخۆیدا بکات بەغەریزە) (هەمان سەرچاوە) لەم ڕووەوە، ئەندێشەی خودئاگا، هێشتا چاوەڕێی یەکبوونە لەگەڵ غەریزەدا.

نیچە، نەك تەنیا بوونی دوو گەوهەری دوانە بۆ ئاشکراکردنی دوالیزمی بیری بەئاگا و بێئاگا بەپێویست نازانێ، بەڵکو ئەو بەهایانەش ئاوەژوو دەکاتەوە کە دوالیزمێکی لەوجۆرەیان بەدواوە بووە.

بەشێوەیەکی باو، لەو ڕووەوە کە بیری خودئاگا هاوشانی ڕۆحە، زیاتر لەبیری ناخودئاگا حسابی بۆ کراوەو بەرز ڕاگیراوە؛ بەڵام هەروەکو بینیمان، نیچە، خودئاگا بەهاوشانی هەڵە دەزانێت و باوەڕیوایە، کە بەهایەك دژی بەهایەکی دیکە نییە، بەڵکو پوختەکراوی ئەوە جگەڵەمەش، زانینی یەکێك لەم بەهایانە وەکو سەرچاوەی ئەوی دیکە و بەهایەکی سەرەتا و بنچینە، شتێکە کە ئێمە لەڕێگەیەوە، ڕوانگەی خۆمانمان ئاشکرا کردووە نەك شتێك بێ

دەربارەی ماهیەتی جیهان، بەباوەڕی نیچە، ئێمە لەو ڕووەوە تەسلیمی (باوەڕ بەدژایەتی بەهاکان) دەبین، کە دەبێتەهۆی سادەکردنی ژیان بۆمان: (مرۆڤ لەچ سادەکردن و درۆکردنێکی سەرسورهێنەرانەدا دەژی!.. ئێمە هەموو شتێکی دەوروبەری خۆمان چەند روون و رەها ئاسان کردوەتەوە! لەسەرەتاوە چەند باش تێگەیشتووین کە نەزانی خۆمان بۆ خۆمان بهێڵینەوە، بۆئەوەی لەئازادی بێماناو بێخەیاڵی و جەربەزەیی و خۆشیەکانی ژیان و خودی ژیانیش بەهرەمەند بین) (فراسوی خیرو شر، ص٣٤)

نیچە، وێڕای نکۆڵی کردن لەدوالیزمی فەلسەفی و میتافیزیکی، لەبەرهەمەکانیدا بەشێوەیەکی ئاشکرا باسی دوالیزمی سێکسی دەکات، هەتا لەکتێبی (فراسوی خیر و شر)یشدا کە پێشیان ئەو بەرهەمەمان وەکو دژی دوالیستی نیچە ناساند ئەم دوالیزمە بەدیدەکرێ، لەو شوێنەدا کە دەڵێ: ژن و پیاو لە (کێشمەکێشێکی هەتاهەتایی و دوژمنانەدا دەژین). (هەمان سەرچاوە ل٢٣٨) دوو ساڵ دوای ئەوەش نیچە هەروا باوەڕی بەشەڕی ڕەگەزەکان هەیە، لەبەرئەوەی کە لەکتێبی (اینك ان انسان) لەلاپەڕە (٥)دا نوسیویەتی (ئایا کەس ئەو پێناسەیەی منی بیستووە کە بۆ عەشقم کردووە؟ ئەوە تاکە پێناسەیەکە کەشایەنی فەیلەسوفێکە، عەشق، لەوەسیلەکانیدا جەنگە و لەبنەماشیدا، نەفرەتی کوشندەی دوو ڕەگەزە) ئەو دوالیزمی ڕەگەزییەی کە نیچە پەسەندی دەکات، دەبێ بەمانای جیاوازیی لەبەرچاو بگیرێ نەك بەمانای دژایەتی، چونکە هەروەکو پێشان ئاماژەمان بۆ کرد، نیچە بەتوندی هێرشی دەکردە سەر هەر دوالیزمێك کە دژایەتی دوو شت پەسەند بکات و لەئەنجامیشدا دژایەتی بەهاکانی ئەو دوانەبێت، سەبارەت بەدژایەتی ژن و پیاوو دژایەتی بەهاکانی ئەم دوانەش هەمان باوەڕی هەبوو.

دەستنیشانکردنی جیاوازیی لەنێوان سێکس (Sex)، کە گوتەیەکی بایۆلۆژییەو (gender)، کە گوتەیەکی دەروونیی- کۆمەڵایەتیە، زۆر گرنگە، رەنگە نیچە، بەراشکاویی شتێکی زیاتر لەجیاوازیی و جیاکاریی باوی نێوان گوتەی بایۆلۆژی سێکس (Sex) و گوتە دەرونیە- کۆمەڵایەتیەکەی واتە Gender ئاشکرا نەکات، بەڵام لەجیاوازی نێوان (مێ بوون) و (ژن بوون) تێدەگات، دوالیزمی سێکسی لەرووی بایۆلۆژییەوە مەسەلەیەکی سروشتیە، زۆربەی ئینسانەکان کە لەدایکدەبن نێرن یان مێ، بەپێی ئامارێك کە توێژەران خستوویانەتەروو رەنگە لەسەدا پێنجی دانیشتوانی جیهان کە لەدایکدەبن رەگەزیان نادیاربێ،

واتە لەرووی پێکهاتەی هۆرمۆنیەوە نە نێرن نە مێ، بەڵام دایك و باوکی ئەم منااڵنە بەخێرایی دەیانبەنە لای دکتۆر و نەشتەرگەرییان بۆ دەکەن بۆئەوەی رەگەزێکی دیارییان پێببەخشن. لەبەرئەوەی ئێمە لەکۆمەڵگەیەکدا دەژین کە تیایدا دوالیزمی سێکسی پێوەرێکە و دەستبەرداربوونی ئەو پێوەرە، ئەنجامی جدی و پر مەترسیی دەبێت بۆ ئەو منالەی نە نێرە نە مێ، بەڵام کاتێ قسە لەپیاو بوون یان ژنبوون، یان پیاوێتی یان ژنێتی دەکەین، واتە کە قسە لەو شوناسە سێکسیە دەکەین کە لەرێگەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەوە بەدەست هێنراون- بەها بۆ پیاوبوون و پیاوێتی دادەنێین و ژنبوون و ژنێتی بێبەها دەکەین، واتە لەم شوێنەدا پێوەری ئێمە، پێوەرێکی پیاوانەیە و هاورێکە لەگەڵ بەهاکانی پیاوێتیدا، لەوێوە کە نیچە، سەبارەت بەتاك زیاتر پشت بەچەمکە سایکۆلۆژیەکان دەبەستێ، دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە نیچە زیاتر پەیرەویی لەبەکارهێنانی شوناسی سێکسی دەروونیی- کۆمەڵایەتی تاك دەکات تا بەکارهێنانی شوناسی بایۆلۆجی تاك، لەبەر حسابکردنی نیچەیە بۆ مانای کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی سێکسی کە باوەری بەدوالیزمی سێکسی نییە، جگەلەمەش نیچە بەتوندی رەخنە لەهەوڵی فیمینیستەکانی سەردەمی خۆی دەگرێ کە زۆرجار لەپێناوی یەکسانیی کۆمەڵایەتیدا، لەرووی بایۆلۆجیەوە نکۆڵییان لەشوناسی سێکسی ژن کردبوو، نیچە باوەری وایە کە یەکسانی بەو مانایە، جگەلە زیان گەیاندن بەژنان شتێکی دیکە نییە و لەم بارەیەوە دەڵێت (کاتێ ژنێك ئارەزووی زانایانەی هەیە، دەبێ لەسێکسیدا گرفتێك هەبێ، چونکە (هێسترێکە) نەزۆکێکە کە مرۆڤ بەرەو جۆرێ ئارەزووی پیاوانە رادەکێشێ، چونکە، لەگەڵ داوای لێبوردندا، پیاو (هێسترە) (فراسوی خیر و شر، ص١٤٤) نیچە باوەریوایە کە جوڵانەوەی لایەنگری مافی ژنان لەئەوروپا، ئەنجامەکەی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ژن دەبێ، ژنان بەلەدەستدانی تایبەتمەندیی ژنانەیان، گەورەترین سەرچاوەی دەسەڵاتی خۆیان لەدەست دەدەن، بەباوەری نیچە هەڵەی گەورەی ژنانی مۆدێرن، (لەدەستدانی ئەو (هەستەیە) کە ئەوە نیشان دەدات مرۆڤ لەکام بواردا لەهەموو بوارەکان لەپێشترە؛ (یەعنی) ئازادکردنی مەشق بەچەکی تایبەتی خود، وازهێنان لەپیاو گەل... لەکاتێکدا بەرلەوە، ژن، لەناو پەردەی خاکیبوونی زیرەکانە و جواندا خۆی حەشاردەدا)) (هەمان سەرچاوە ل ٢٣٩) نیچە، لەدەستدانی غەریزەی ژنانە بەجۆرێك لەلەناوچوون و دواکەوتنی ژن دەزانێت، لەبەرئەوەی نیچە لێرەدا باس لەو تایبەتمەندییە بایۆلۆژیانەی ژنان

دەكات كە دەتوانێت هێزیان بداتێ، ئەم قسەیەی نیچە دەتوانرێ لەگەڵ بیر وبۆچوونی سیمون دی بۆڤوار لەپێشەكی كتێبی (جنس دوم-رەگەزی دووەم )دا بەراورد بكرێ، كە لەجێگەیەكیدا دەڵێ: (تەنها هێزێ كە ئێمەی ژنان دەتوانین هەمانبێ، هێزێكی راستەقینەیە كە تەنها بەقبوڵكردنی ژنێتیمان بەدەست دێت) (جنس دوم، مقدمه) بەم پێیە، نیچە و بۆڤوار، فۆرمێكیان لەهێزی راستەقینە دەست نیشانكردبوو، كە ژنان دەتوانن بەدەستی بهێنن، نكۆڵیكردن لەرۆڵەكانی سێكس لەرووی بایۆلۆجیەوە، نكۆڵی كردنە لەژیان و ناتوانێ ئەو ئازادییە بەژنان ببەخشێ كە چاوەڕێی دەكەن، لەم رووەوە، (ئەگەرچی نیچە، ئاگای لەجیاوازی نێوان گوتەی بایۆلۆجی (مێ بوون) و گوتەی كۆمەڵایەتی (ژنبوون)ە بەڵام باوەڕی بەدوالیزمی سێكسی نییە، كە گوتەی (ژن) پێناسە دەكات (لین تیرل، ۱۹۹۸، ص ۲۰۷) كەواتە ئیشكردنی نیچە لەدوالیزمدا، وا لێكدراوەتەوە كە پەیوندیی بەراستیی ئەو بەهایانەوە هەیە كە بۆ ژنان و پیاوان دانراون و رەتكردنەوەی بەهادانانە بۆ پیاوێتی و بێبەها كردنی ژنێتی، ئەگەر بمانەوێ رەتكردنەوەی دوالیزمی سێكسی لەروانگەی نیچەوە، بەبەڵگەوەو بەكورتی دەربڕین، دەتوانین بڵێین: (۱-پیاوان، تەنها لەرووی نەریتەوە بەبەهاتر لەژنان لەقەڵەم دراون، ۲-پیاوان و ژنان وەكو مرۆڤ بەراستی جیاواز نین، بەڵكو خود و رەچەڵەكێكی یەكسانیان هەیە، ۳-پیاوان و ژنان لەراستیدا دژی یەكتری نین، بەڵكو لەگەڵ یەكتریدا جیاوازییان هەیە؛ ٤-ئێمە (پیاوان و ژنان) تەسلیمی بنەما لەرادە بەدەر سادە كراوەكانی ئەم بیرو بۆچوونانە دەبین كە رۆڵی دوانەی سێكسی و بەهاكانیان جیاوازە). (لین تیرل، ۱۹۹۸، ص۲۰۸) بەكارهێنان و سەپاندنی دوالیزمی سێكسی بەسەركەوتوویی ئەنجامدرا، چونكە هەروەكو وتمان، مرۆڤ خەریكی ئاسان كردنی ژیانە بۆ خۆی و باوەڕیش بەدوالیزمی سێكسی ژیان ئاسان دەكات و هەتا ئێستا پیاوان ئەم ئاسانكارییەیان بەئامرازی (ئۆبجێكتیڤی) (یەعنی بینینی شتەكان بەبەتاڵی لەچاوی دوربینەوە)، ئارمانی دورەپەرێزیی و هێزی ناونانەوە ئەنجامداوە.

ب/ روانگەگەرایی

نیچە، لەجیاتی (ئەپستمۆلۆجیا)، (تیۆری روانگەی سۆز) (خواست قدرت، ص٤٦٣) لەتەواوی بەرهەمەكانیدا شیدەكاتەوەو روانگەگەرایی دەخاتە شوێنی ئەپستمۆلۆجیای كۆن، ئێستا دەبێ بزانین تایبەتمەندیی ئەم جێگۆڕكێیە چییە و لەبنەڕەتدا روانگەگەرایی بەچ مەعنایەكە. بەڕای نیچە، زانینی راستیی بۆ

ئینسانەکان لەڕێگەی ڕوانگەیەکی تایبەتەوە نەبێ کاری کردە نییە و ئێمە هەمووموان لەڕوانگەیەکی تایبەتەوەو بەحسابکردن بۆ باردۆخی ژیانی خۆمان لەڕاستیی تێدەگەین. لەم نێوەندەدا فەیلەسوفەکانیش وەکو باقی ئینسانەکان لەکاتێکدا لەڕاستی و بەها ڕاستەقینەکان دەکۆڵنەوە، لەڕاستیدا لەڕوانگەی خۆیانەوەو بەئاراستەی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان لەو مەسەلەیە دەڕوانن و لێرەوە دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە فەیلەسوفەکان، وەکو لەئەپستمۆلۆجیادا رایدەگەیەنن، ڕوانینێکی بێمەبەست و بێنیازیان نییە و بەپێی ڕوانگەی خۆیان، باسی ڕاستییان کردوە. ئەم مەسەلەیە خۆی لەخۆیدا دەبێتەهۆی ڕێژەییبوونی ڕاستی و بەم پێیە حەقیقەتی (ڕەها)ی حەقیقەت بەو شێوەیەی کە ئەفلاتون باوەڕی پێی هەبوو لەئارادا نابێ، چونکە نیچە (قسەکردن لەسەر ڕۆح و خێر بەشێوەی ئەفلاتون) بە(ئاوەژووکردنەوەی ڕاستی و نکۆڵیکردن لەڕوانگە (فراسوی خیرو شر، پیش گفتار) دەزانێ و لەوێوە کە نیچە ڕوانگەگەرایی بە(مەرجی بنەڕەتی سەراپای ژیان) دەزانێ، (هەمان سەرچاوە) نکۆڵیکردن لەڕوانگە، واتە نکۆڵیکردن لەهەمموو شتێ.

بەم پێیە ئەگەر نزیکیی ئێمە لەگەڵ ڕاستیدا پەیوەستبێ بەڕوانگەمانەوە سەبارەت بەڕاستی و پێویستیمان پێی، لەم حاڵەتەدا ئەو پێویستییە بەهەرشێوەیەك بیەوێت ڕاستیمان بەو شێوەیە نیشاندەدات و ئەمە خاڵێکە کە فیمینیستەکان بەئاراستەی گۆڕینی بەها دانان بۆ ژنان و خستنە ژێر پرسیاری جێگیرکردنی جیاوازییە سێکسییەکان سودیان لێوەرگرتوە، نیچە لەتێکستێکدا بەناونیشانی (ئیرادە و ملکەچکردن) لەبەرگی دووەمی کتێبی (دانش شاد-زانستی شاد)دا، حییکایەتێکی ئەخلاقی دەگێڕێتەوە کە تیایدا ڕۆڵە سێکسییەکان جێگیربوون و سود و قازانجی ئەوە بۆ پیاوان و ژنان نیشاندەدات:

(کوڕێکی گەنجیان بردە لای زانایەکی ژیر و وتیان: (ژنان خەریکە ئەم کوڕە خراپ و گەندەڵ دەکەن) زانای ژیر سەرێکی بادا، بزەیەکی هاتێ و هاواری کرد (ئەوە پیاوانن کە ژنان خراپ و گەندەڵ دەکەن! هەر کەم وکورتییەك لەژناندا هەبێ دەبێ پیاوان باجەکەی بدەن و لە وجودی خۆیاندا ئەو کەم وکورتییە چارەسەربکەن- چونکە ئەوە پیاوە کە وێنەی ژن بۆ خۆی دروستدەکات و ژن تەنها خۆی لەگەڵ ئەو وێنەیەدا دەگونجێنێ).. یەکێك لەناو مەجلیسەکەدا وتی (دەبێ ژنان باشتر پەروەردە بکرێن!) زانا وتی (دەبێ پیاوان باشتر پەروەردە بکرێن) (دانش شاد، ص ٦٨) نیچە دەڵێت: (ئەوە پیاوە کە وێنەی ژن بۆ خۆی دروستدەکات و ژن تەنها خۆی لەگەڵ ئەو وێنەیەدا دەگونجێنێ)، لەم گوتەیەدا

دەتوانرێ رەگ وریشەی ئەو قسەیەی سیمۆن دی بۆڤوار بەدیبکرێ کە دەڵێت: (ئەوە ژنە کە بەگێراندنەوەی بۆ لای پیاو پێناسە و دیاری دەکرێ، نەك بەپێچەوانەوە، ژن پاشکۆ و ژێردەستە و دژی پیاوە، پیاو بکەر و رەهایە- ژن، ئەوی دیە) (سیمون دی بۆڤوار، ١٩٧٤، ص XiX) هەم نیچە و هەم بۆڤوار باوەڕیانوایە کە ئەم ناکۆکیی و دوبەرەکییەی ژن وپیاو، واتە ئەوەی کە پیاو یەکەمە و ژن دووەم، ناکۆکییەکی ناپەیوەست و نابەجێیە و بە لەبەرچاوگرتنی یەکێك لەبەهاکان وەکو یەکەم بەها، بۆ نموونە بەلەبەرچاوگرتنی پیاو وەکو رەگەزی یەکەم، لەڕاستیدا ئێمە روانگەگەرایی خۆمان ئاشکراکردوە، بەڵام لەم هەڵسەنگاندنە نایەکسانەدا ژنان زەرەرمەند دەبن، هەروەها بۆڤوار باسی ئەوەی کردوە کە پیاو دەیەوێ رەهابێت، بەڵام بەڕای نیچە رەهابوون نابێ ئامانجی ژن بێت، بەڵکو ئامانجی ژن دەبێت لەگەڵ روانگەی خۆیدا هاوڕێك بێ، هەڵبەتە ژن لەبەشێکی ئەم کارەدا شکست دەخوات، چونکە (هونەری گەورەی ژن درۆکردنە و گرنگترین سەرقاڵیی ئەو خۆ خەریککردنە بەرواڵەت و جوانییەوە) (فراسوی خیر و شر، ص ٢٣٢). ئەگەر بمانەوێ شێوازەکەی بۆڤوار بەکاربێنین، رۆڵی ژن وەکو (ئەوی دی)، ژن دەکات بەئەکتەرێك کە پشتی بەخۆهەڵکێشان و وەهمەکانی بۆ ژیانی خۆی بەستووە، بەڵام هەڵەی ژن لەم نێوەندەدا، بریتییە لەفریوخواردن بەدەستی وەهمەکانی خۆی، ژن لەدەلاقەی چاوی کەسانی دیەوە نەبێ خۆی نابینێ، کێشەیەکی دیکەی ژن ئەوەیە کە دەستبەرداری روانگەی خۆی دەبێ و لەڕوانگەی پیاوەوە تەماشای هەموو شتێك و بەتایبەتی تەماشای خۆشی دەکات، نیچە دەپرسێت: (قەناعەتکردن بەدراوسێ و پاشان هاتنە سەر بیروڕای ئەو لەم میتۆدەدا چ کەسێ لەگەڵ ژناندا داوای یەکسانی دەکات و هاوکاریانە؟) (فراسوی خیر و شر، ص ١٤٨)، رەنگە باسکردنی خاڵێك لێرەدا بێسود نەبێ و ئەویش ئەوەیە کە رەنگە رۆڵگێران خۆی لەخۆیدا خراپ نەبێ و هەتا نیچەش بەبەشێکی پێویستی ژیانی هەر کەسێکی بزانێ، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە ژن، رۆڵێك دەگێرێ کە سیناریۆکەی پیاو نوسیویەتی، هەربۆیە ناتوانێت روانگەکانی خۆی دەربڕێت.

پیاو وێنەیەکی ژن بۆ خۆی دەکێشێ و پاشان ژن ناچارە خۆی لەگەڵ ئەو وێنەیەدا بگونجێنێ، لەبەرئەوەی ئەو ژنەی پیاو بەدڵێتی و دەیەوێت، واتە ئەو ژنەی (کچەی) پیاو دەیکات بەهاوسەری خۆی و دەیپارێزێ، ژنێکە کە لەهەموو

روویەکەوە عازەب (باکرە)بێت! لەگەڵ بەدەستەوەدانی پێناسەیەکی لەمجۆرە و یەکسانکردنی بەفەزڵ و بەهای ژنانە، پیاو پێوەرێك دەهێنێتە ئاراوە، کە ژن دەبێ لەتەواوی بوارەکانی ژیانی خۆیدا، وەکو بواری ئابوریی، کۆمەڵایەتی، دەرونیی، قبوڵی بکات، ئەم خاڵە مایەی سەرنجە و لەهەمانکاتدا جێگەی داخە کە ژن چ ئەم پێوەرە قبوڵ بکات یان نا، دەکەوێتە بەر تانە و نەفرەتی پیاو، سەیر لەوەدایە کە نیچە، مەترسییەکانی قبوڵکردنی ئەم پێوەرە لەلایەن ژنانەوە دەبینێ، بەڵام لەهەمانکاتدا ژنان لەئاستەنگێکدا دەبینێ کە پیاوان بۆیان خوڵقاندون و باوەڕیوایە کە ئەم مەسەلەیە، پێگەی ژنان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی زیاتر، دژوار دەکات: (خەسڵەتی پیاو ئیرادە و خەسڵەتی ژن، قبوڵکردنی فەرمانە- لەراستیدا ئەمە یاسای جنسەکانە، کە هەڵبەتە بۆ ژن یاسایەکی سەختە. هەموو ئینسانەکان، دەربارەی چۆنێتی ژیانی خۆیان بێدەسەڵات و بێگوناهن، بەڵام بێگوناهی ژن زیاترە: (کێ بەرامبەر بەژن لوتف و نەرم ونیانی بەرەوا دەزانێ؟) (دانش شاد، ص ٦٨)، بۆڤوار-یش ئەم شیکردنەوەیەی نیچە بەم گوتەیە رووندەکاتەوە کە باشترین و ئاسانترین و دڵنیاترین رێگە بۆ بەدەسەڵات گەیشتنی ژنان، قبوڵکردنی پێناسەی پیاوانە سەبارەت بەژن، ژنان دەسەڵاتێکی کەمیان بەسەر سیستمی پیاوسالاریدا هەیە و نکۆڵیکردن لەو پێوەرانەی کە پیاوان بۆیان خولقاندون، رەنگە ببێتەهۆی ئەوەی ئەو دەسەڵاتە کەمەش لەدەستبدەن کە پێشان هەیانبووە.

رەنگە یەکێکی تر لەهۆیەکانی ئەم مەسەلەیە، بەپێی قسەی نیچە، ئەوەبێ کە: (ئەمرۆ مرۆڤی ئاساییش چاوەڕێی بیروبۆچوونێکە سەبارەت بەخۆی و پاشان بەپێی غەریزە خۆی بەو بیروبۆچوونە دەسپێرێ) (فراسوی خیر و شر، ص ٣٦١).

بەشێوەیەکی گشتیی، دەتوانرێ بگوترێ کە نیچە، جیاوازیی لەنێوان (خود) و (ئەوی دی) و (پیاو) و (ژن)دا بەمەسەلەیەك دەزانێ کە پەیوەندیی بەروانگەی جیاواز و دوای ئەوەش پەیوەندیی بەبەها جیاوازەکانەوە هەیە، هەتا جیاوازیی بنەڕەتی لەنێوان ئاکاری سەروەر و ئاکاری کۆیلەشدا جۆرێکە لەروانگەگەرایی، ئەم جیاوازییە پەیوەندیی بەو مەسەلەیەوە هەیە کە چۆن هەریەکە لەسەروەران و کۆیلەکان، بەهاکانی خۆیان بەدەستدەهێنن، هەم سەروەران و هەم کۆیلەکان، بەهاکانی سەروەران بەبەهای یەکەم دەزانن، بۆ بەیانکردنی ئاکاری سەروەریی،

وشەی (باڵا) لەپێشەوەی دادەنرێ، کە لەگەڵ شێوازی ژیانی خودی سەرروەردا پێناسەدەکرێ و (نزم) لەپلەی دووەمدا دێت کە بۆ ئەو کەسانەی لەسەرروەران لەخوارترن، بەکاردێت. لای کۆیلەش ئەو ئەخلاقە (باڵا)یەی سەروەر کە بۆ کۆیلە بە (شەڕ) لەقەڵەم دەدرێ، لەپلەی یەکەمدایە و کەوتنە سەرزەوی خۆی کە بەڕای ئەو وەکو (خێر) خۆی دەنوێنێ، بەپلەی دووەم دێت. سەرروەران (گەورەکان) تەماشای خۆیان دەکەن و دەڵێن (ئێمە راستین) کۆیلەکانیش بەرقەوە تەماشایان دەکەن و بەزۆردار و شەڕانگێزیان دەزانن، لەم رووەوە نیچە روانگەگەرایی بەهاکان نەك تەنها سەبارەت بەئەخلاق، بەڵکو لەسەراپای ژیانی مرۆڤدا وا دەبینێ کە وابەستەیە بەدیدگای تاکەکانەوە.

دواجار، دەتوانرێ بگوترێ کە پیاوان و ژنان بەراستی دژی یەکتری نین، بەڵکو یەکێکیان پاکیزەکراوی ئەوی تریانە، بەڵام ئەوەی کە کام لەم دوانە بەپاکیزەکراوی ئەوی تریان بزانین، مەسەلەیەکە لەڕێگەی دیدگای ئێمەوە ئەنجامدەدرێ و روانگەگەرایی ئێمە نیشاندەدات نەك مەسەلەیەکی سروشتی، زاتی و یان راستییەك دەربارەی پیاو یان ژن.

هەروەکو وتمان، روانگەگەرایی، بیرۆکەیەکە کە نیچە دەیخاتەشوێنی تیۆری ئەپستمۆلۆجیای کۆن، لەڕاستیدا (ئەم روانگەگەراییەیە کە تیۆری ئەپستمۆلۆجیا (مەعریفەزانی) بۆ فیمینیستەکان فەراهەمدەکات) (دنیل، دابلیو، کانوی، ١٩٩٨، ص٢٥٦)، لەم پەرەگرافەی خوارەوەدا نیچە چەند خاڵێك دەخاتەروو کە تیۆرسینە فیمینیستەکان بۆ خستنەڕووی تیۆری ئەپستمۆلۆجیای خۆیان، سوودی لێوەردەگرن:

(کەواتە فەیلەسوفان، گەورەکانم، لێرە بەدواوە لەبەرامبەر ئەو ئەفسانە ترسناکە دێرینەدا کە (بکەرێکی ئاگای ئەبستراکتی بێخواستی بێئازاری بێکات) فەراهەمدەکات؛ بازیاتر ئاگامان لەخۆمان بێت و لەداوی چەند چەمکێکی ناتەبای وەکو (عەقڵی پەتی)، (رۆحی رەها) و (زانست خۆی لەخۆیدا) خۆمان بەدور بگرین لەبەرئەوەی ئەم چەمکانە هەمیشە چاوەڕوانیی بیرکردنەوەمان لێدەکەن لەڕوانگەیەکەوە، کە هەرگیز بیری لێوە ناکرێتەوە، واتە چاوێك تەماشای هیچ لایەك ناکات و ئاماژەی هێزی ئەکتیڤ و راڤەکەری تێدا نەبێ، یەعنی ئەو هێزانەی کە لەڕێگەیانەوە هەمیشە شتێ دەبینرێ، کە ئەو چاوەڕوانییە پوچ و بێمانایە لەچاوی بینینەوە واتە لەڕوانگەوە، بینین و بەس، (زانین) یەعنی لەڕوانگەوە، زانین و بەس، هەرچی دابنێین و سۆزێکی زیاتر

لەبارەی شتێکەوە قسە لەگەڵ ئێمە دەکات، کە چاوی زیاتر و جۆراوجۆر و ترمان لەسەر داناوەو (تێگەیشتن)ی ئێمە لێی و (روانگەگەرایی) ئێمە لەو بارەیەوە کامڵتردەبێ- (تبارشناسی اخلاق، ١١١، ص١٢). بەئاشکراکردنی ئەم مەسەلەیە، بەر لەهەرشتێ نیچە لەوە ئاگادارمان دەکاتەوە، کە وەکو (روانینی بێ ئایدیا) ئاگامان لەراڤەی کۆنی (روانگەگەرایی)بێت، ئامانجی ئەندێشەی بێمەبەست و روانینی بێئایدیا، گریمانەکردنی (ئەفسانەی ترسناکی چەمکێکی دێرینە) و (چەمکی ناتەبایە) کە وێرای ئەوە، ناچارمان دەکات (بکەرێکی ئاگای ئەبستراکتی بێخواستی بێئازاری بێکات)مان هەبێت، واتە (چاوێك کە تەماشای هیچ لایەك نەکات)، بەم پێیە روانگەگەرایی نیچە، بەنیازە ئەو بەشانەی کە بەشێوەیەکی کۆن، لەلایەن ئەپستمۆلۆجیاوە لەبەرچاو نەگیراون بەیان بکات، نیچە بە بەیانکردنی بیروباوەری خۆی لەبابەتی روانگەگەراییدا، وێنەیەکی دەرەکیی و بەدەنیی پێدەبەخشێ و بۆ بەیانکردنی سود لەسۆز وەردەگرێ، واتە چەند بەشێ بۆ روانگەگەرایی وەکو گریمانە دەگرێ کە بەتەواوی لەئەپستمۆلۆجیای کۆندا تور دراون، بەلای نیچەوە روانگەکان، چەند دیدگایەك نین لەبەدەن، لەکاتێکدا کە نیچە بینین و چاو بۆ بەیانکردنی (هێزە ئەکتیڤ و راڤەکەرەکان) بەکاردەهێنێ، وامان لێدەکات کە وەکو بەدەن لەروانگەکانیش تێبگەین، رەخنەی نیچە لەروانگەگەرایی کۆنی فەلسەفی، کە تائێستا نەك تەنها ئەندێشەیەکی بێمەبەست و روانینێکی بێئایدیا نەبووە، بەڵکو هەمیشە هاوشانی ئەوە بووە کە رۆحانی و ئەودیو روانگەیی و پاتریارکیانەیە، خاڵێکە کە فیمینیستەکان، بەئاراستەی بەرەوپێشە وەبردنی ئامانجی خۆیان سودیان لێوەرگرتوە.

رەخنەگرتن لەئارمانی دوورەپەرێزیی

نیچە، لەبەشی سێیەمی کتێبی (تبارشناسی اخلاق- ئارکیۆلۆژیای ئاکار)دا مانای ئارمانی دورەپەرێزیی دەخاتەروو کە ئارمانێکی نامادیی و نابەدەنیی و لەئەنجامیشدا نادنیایی و نا (هەوەس)ییە.

نیچە مانا جیاواز و سەرنجراکێشیەکانی ئارمانی دورەپەرێزیی بەیاندەکات، کە سەبارەت بەکەسە جیاوازەکان هەیەتی و هۆی مانا جیاوازەکانی ئارمانی دورەپەرێزیی بۆ بوونی (خواست)ە جیاوازەکان دەگەرێنێتەوە، کە دواجار هەموویان لەبەر ترس لەنەبوون و پوچی و لەهەمانکاتدا بۆ بەدەستهێنانی ئامانج و مانایەك بۆ ژیان هەوڵدەدەن، هەرچەندە ئەو ئامانجە جگە لەنکۆڵیکردن لەژیان شتێکی دیکە نەبێت، هەروەکو دیمان، نیچە، دژایەتی و کێشمەکێشێك لەنێوان

ئەو شتانەدا نابینێ کە ئینسانەکان و لەوانیش فەیلەسوفەکان بەناکۆکیان دەزانن، یەکێك لەو دوو دژانە بریتییە لەپاکیزەیی- هەوەس. نیچە، لەم بارەیەشەوە بەهیچ ناکۆکییەك قایل نییە و باوەڕیوایە کە مرۆڤی ساغ، دەتوانێت لەنێوان ئاژەڵێتی رووت و دژی هەوەسبازبووندا هاوسەنگییەك دروستبکات. بەڵام هەوەس، لەئارمانی دورەپەرێزییدا بەتەواویی رەتدەکرێتەوەو لەم رووەوە رێگەیەکە بۆ رزگاربوون لەفشاری هەڵچوونی سێکسی، هەروەکو نیچە دەربارەی شوپنهاوەر و رێزگرتنی لەئارمانی دورەپەرێزیی، وا بیری دەکردەوە، جگە لەشۆپنهاوەر کە کێشەی رۆحیی و دەرونیی سەبارەت بەدایکی و دڵدارە بێوەفاکەی هەبوو، هەموو فەیلەسوفەکان سەبارەت بەهەوەس و هەڵچوونە سێکسییەکان، نەفرەت و بێزارییەکی سەیریان نیشانداوە، ئایا ئەمە بەو مانایە نییە کە ئەم فەیلەسوفانە نەفرەتیان لەژنانیش کردوە؟ لەبەرئەوەی ژیانی پر لەپارێز و دورەپەرێزییان بۆ دژواردەکردن؟ لەگەڵ ئەوەشدا، پیاو هەمیشە بەشوێن خواستی ژن و ناسینی ژنەوە بووە. هەروەکو فرۆید کە دواساڵەکانی تەمەنی لەبێئارامیی و نیگەرانی ئەو پرسیارەدا بەسەربرد کە (ژن چیی دەوێ؟) بێگومان ئەمە پرسیارێکە تەنها لەنێو پیاواندا و وەڵامدانەوەشی تەنها خواستی پیاوانە. نیچە، مەترسییەکانی خواستی پیاو و ئارمانی دورەپەرێزیی ئاشکرا کرد.

ئەرکی پیاوان- وەك دەزانین گەڕانی وردنەبوو بەدوای داخوازییەکانی ژندا، بەڵکو شاردنەوەی خواستەکانی پیاوبوو، پیاو وەکو مرۆڤێك، ناتوانێ پرسیار لەزادگە و شوێنی گەورەبوونی خۆی فەرامۆشبکات، فۆرمۆڵی نیچە دەربارەی خواستی پیاو، کە (خواستێکی چالاکە) بۆ (بەدواداچوونی شتێك کە سەر وەختێ بەشوێنییەوەبوو) (تبار شناسی اخلاق، ١١، ص١). لەفۆرمۆڵی فرۆیدیشدا، بۆ چارەسەرکردنی گرێی ئۆدیب، دوبارە دەبێتەوە: واتە سەرلەنوێ داواکردنی شتێك کە سەروەختێ داوا کراوە، واتە دۆزینەوەی بکەرێ کە هەمیشە سەرلەنوێ دۆزینەوەی بکەرێکی ونەو فرۆید لەکاتێکدا کە لەبارەی پیاوەوە قسەدەکات، مەبەستی لەبکەرێکی دڵخواز بەڵام ونی ئەوە، ئەو بکەرەش دایکە. بەپێی باوەڕی دەرونشیکارانی وەکو لاکان، دەربارەی فرۆید و شیکردنەوەی گرێی ئۆدیب کە فرۆید ئاشکرای کردوە، گرێی ئۆدیب بەپێی یاسای باوك، بەئاراستەی سەرکوتکردنی مەیل و ئارەزووی کور (پیاوی ئاییندە) لەبەرامبەر دایکدا کاردەکات، بەڵام داخوازیی پیاو بەئاراستەی سەرلەنوێ دۆزینەوەی ئەو بکەرە ونە کاردەکات و سەرئەنجام دۆزینەوەی نۆبووکێکی شەرمن و لەراستیدا

بەدووبارە دۆزینەوەی دایك، وەڵامی ئەو خواستەی خۆی دەداتەوە.

گوتەکانی نیچە، دەتوانرێ بەئاراستەی لەکارخستنی کاریگەریی گریی ئۆدیبی فرۆید لێکبدرێتەوە، ژن بەلای زەردەشتی نیچەوە، یادەوەریی کەسێکە کە گەڕانەوەی جاویدانی لەدوای مەرگی خودا (واتە لەدوای مەرگی باوکسالاریی) دەهێنێتەوە یاد و لەم رووەوەیە کە زەردەشت، دەزانێت کە هەموو دۆزینەوەکان، وەکو سەرلەنوێ دۆزینەوە وان. وەکو لەڕاڤەکردنەکانی دەرونشیکارانی، وەکو فرۆید و لاکاندا، دەردەکەوێ، ئەو وێنەیەی کە نیچە، بۆ دایك (ژن) دەیکێشێ، بەهیچ شێوەیەك بەپێی یاسای باوك نییە، پیاو، دەزانێت کە سەرچاوەی ئارەزووی، سەرچاوەیەکی دڵنیا نییە، چونکە پیاو بێتوانااییەکانی خۆی دیاریدەکات و دەزانێ کە ناتوانێ زادگەی بوونی خۆی و کۆتایشی بێت، کەواتە پیاو چۆن لەجێگایەکی دیکەیە، ژن وەکو زادگە پێویستی بەگەڕانەوە نییە، ژن هەمیشە و بەر لەهەمووان لەو شوێنە بووە، لەو رووەوە، پیاو دەزانێ کە زادگەی بوونی، هەمیشە وەکو پێویست (ئەوی دیە). ئایا ئەم مەسەلەیە، بەهای (خود) پەیوەست بە (ئەوی دی) ناخاتە ژێر پرسیارەوە؟ بەباوەڕی فیمینیستەکان، پیاوسالاریی،تائێستاپەردەیەکی ئەستوری داوە بەهێنانە ژێر پرسیاری زادگەداو ویستویەتی وەڵامی ئەو پرسیارەی پیاو کە خواستی ژن و ناسینێتی، بەداهێنانی ئارمانی دورەپەرێزیی بداتەوە.

د/ دەسەڵاتی ناونان

وێرای ستایلی نووسین و سوودوەرگرتنی تایبەتی نیچە لەزمان لەقاڵبی خوازەو مەجاز و خەیاڵ و قسەی هەڵبژاردەو مۆنۆلۆگ و... کە یارمەتییەکی بەرچاوی فیمینیستەکانی داوە بۆ هێنانەکایەی نوسینێکی ژنانە، لوسێ ئیریگاری (Luce Irigaray)یش جەخت لەم مەسەلەیە دەکاتەوەو باوەڕیوایە کە ستایلی نیچە، ستایل (شێواز)ێکە کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەپێوەرە زمانەوانییە باوەکان دووردەکەوێتەوە و پشتیوانیی لەئەگەرێکی تازە دەکات سەبارەت بەنووسینێکی ژنانە، رەخنەی نیچە لەزمان و ئەو رەخنەیەی لە وتەزا میتافیزیکییەکانی دەگرێ، دەتوانرێ بۆ پشتیوانیی لەڕەخنەی فیمینیستی لەفەلسەفەی کۆن بەکاربهێنرێ، نیچە زمان بەهاوبەش و هاوکارێك دەزانێت بۆ بنەڕەتیبوونی زیرەکانەی کۆمەڵێ چەمك لەفەلسەفە و میتافیزیکدا کە لەڕاستیدا شتێك نییە جگە لەڕەنگدانەوەی ئەو وشانەی ئێمە بۆ ناونانیان بەکارمانهێناوە، نیچە لەپێشەکی کتێبی (ئەودیوی چاکە و خراپە) و لەبەشەکانی دیکەشیدا، باسی






ئەو ئایدیا گرنگە دەکات کە یەکێك لەفاکتەرەکانی ئەو دۆگماتیزمەی کە لەبیرکردنەوەی ئێمەدا فۆرمەڵە بووە، بریتییە لەڕێزمان و (گەمەکانی زمان)، نیچە زمان بەفەرمانڕەوای جیهان دەزانێ و پێیوایە جیهان هەموو ئەوانەی تێیدایە، ڕەنگدانەوەیەکی دروستکردنی ڕێزمانە، نیچە دەربارەی دەسەڵاتی داهێنانی زمان و وشە، لەفەسڵی دووەمی کتێبی (زانستی شاد)دا کە پردێکی پەیوەندیی گرنگە لەنێوان یەکەمجار قبوڵکردنی دوالیزم لەکتێبی (لەدایکبوونی تراژیدی)داو پاشان نکۆڵیلێکردنی لەکتێبی (ئەودیوی چاکە و خراپە)دا، دەربارەی ئەو دەسەڵاتەی کۆسمۆپۆلتیزمی زمان ئاوا دەدوێ (ئەوەی کە بوەتە هۆی زۆرترین زەحمەت بۆ من و هێشتاش زەحمەتم دەدات ئەوەیە کە هەستدەکەم زانینی ناوی شتەکان زۆر لەناسینی خودی شتەکان گرنگترە، ناوو ناوبانگ و گرنگیی و بروکێشی ئاسایی هەموو شتێ- واتە ئەو خاسییەتانەی کە سەرەتا، زۆرجار بەهەڵە و دەستنیشانکردنی خودسەرانە، وەکو جل وبەرگێك کە بەقووڵیی بەناوەڕۆك و شێوەی نامۆیە هاتوەتە ئاراوە- لەبەر باوەڕی ئێمە و فراوانبوون و کامڵبوونی ئەو خاسییەتانە لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە وردەوردە تێکەڵی ئەو شتەبووەو بووە بەشوناس و دواجار بووە بەبەدەنی ئەو شتە. شێوەی سەرەتایی هەر شتێ تەقریبەن هەمیشە دەبێت بەناوەڕۆکی و وا خۆی دەنوێنێ، کە لەبنەڕەتدا ناوەڕۆکی بووە، (دانش شاد، ص٥٨).

هەروەکو لەبەشەکانی رابردودا ئاماژەی بۆ کراوە، ئەوە پیاوبوو کە هەموو شتێکی بەوە دەخوڵقاند کە مانا و پێناسەی پێدەبەخشی، پیاو بەهەمان ڕێگە ژنیش خەڵقدەکات کە دنیاکەی پێ خەڵق دەکات، بەپێی قسەی نیچە، پیاو ئەم کارە بە (دەسەڵاتی ناونان) ئەنجامدەدات. هەروەها لەفەسڵی پێنجەمی (زانستی شاد)دا، نیچە بەڕاشکاویی بۆ قسەکردن لەسەر عەشقی دوو ڕەگەزی جیاواز، سوود لەزمانی سەرووەرو کۆیلە یان زمانی پیاو و ژن وەردەگرێ) نیچە دەڵێت: (عەشق بەلای ژنەوە بەمانای (تەسلیمبوونی تەواوەتییە)، بەڵام ئەگەر پیاو وەکو ژن عەشق بکات دەبێت بەکۆیلە (هەمان سەرچاوە ل٣٦٣). مایەی سەرنجە ئەوە بزانین کە لەڕوانگەی نیچەوە، فیداکاریی ژن لەعەشقیدا بەرامبەر بەپیاو، بایەخی نییە، بەڵگەی ئەم کارە لەوێدا دەبینین کە نیچە باس لەپاکیزەیی ژنان دەکات و هاودەردیی خۆی بۆ ژنان دەردەبڕێ (هەمان، سەرچاوە ل٧١) لێرەدا نیچە سەبارەت بەڕەفتاری پیاوان لەگەڵ ژناندا، بەتایبەتی لەمەسەلە سێکسییەکاندا قسە دەکات و باوەڕیوایە ئەو ڕەفتارەی کە پیاوان سەبارەت





بەم مەسەلانە گرتوویانەتەبەر، پیاوان دەکات بە (فاعیل)ی سێکسی و ژنانیش دەکات بە (مەفعول)ی سێکسی و بەم پێیەیە کە پیاو ژیانی عاشقانەی ژن ئیفلیج دەکات، نیچە ئەوە دەستنیشاندەکات کە ژیانی عاشقانەی هەرکەسێ رۆڵێکی سەرەکیی و بنەڕەتی هەیە لەژیانی ئەو کەسەدا، نیچە لەم بارەیەوە دەنوسێ (بڕ و جۆری ئارەزوی سێکسی هەر مرۆڤێ هەتا دوا ترۆپکی گیانی ئەو مرۆڤە بڕدەکات) (فراسوی خیرو شر، ص٧٥). بەقبوڵکردنی ئەم غەفڵەتە سێکسییە، ژن هەموو وزەو توانای خۆی بۆ هەبوونی ژیانێکی عاشقانەی ساغ لەدەستدەدات و جگە لەبێدەنگیی هیچ رێگەیەکی تر ناگرێتەبەر (دیسان هەمان بێدەنگیی پێشان و هەمان بێدەنگیی قول: ژن هەتا لەبەرامبەر خۆشیدا بێدەنگدەبێت و چاوانی لەئاستی خۆشیدا دادەخات) (دانش شاد، ص٧١)، ژن بەم بێدەنگیی و چاوداخستنەی لەبەرامبەر خۆیدا، لەڕاستیدا دەسەڵاتی شارەزایی لەدەربڕین و دەسەڵاتی خۆی لەدەستدەدات.





فیمینیستە هاوچەرخەکان بۆ تێگەیشتنی باشتر و زیاتری ئەوەی کە نیچە بەدەسەڵاتی ناونان ناوی دەبات، هەوڵی زۆریانداوە بۆ ئەوەی بتوانن چەند رێگە و میتۆدێك فۆرمەڵە بکەن بۆ ئەوەی بوونی مرۆڤ لەجیهاندا راڤە بکات و ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئەوان ئاگاداری ئەو مەسەلەیەن کە میحوەری قسە و گوتار هەمیشە لەژێر دەسەڵاتی پیاواندابووە، فیمینیستە هاوچەرخەکان بەبەکارهێنانی زاراوەی (دەسەڵاتی ناونان)ی نیچە، وا قسە دەکەن کە (پیاوان لەرێگەی بەکارهێنانی دەسەڵاتی ناونانەوە، لەڕاستی خواست و ویستی دەسەڵاتی خۆیان زیاد دەکەن) (لین تیرل، ١٩٩٨: ص٣١٤) پیاوان لەم رێگەیەوە، نەك تەنها ژنان دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، بەڵکو تەواوی جیهانیش دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، بۆڤاریش بەجوانیی هەستی بەم خاڵە کرد، ئەوەتا دەڵێت: (نیشاندان و خستنەڕووی جیهان وەکو جیهانێکی واقیعی، ئیشی پیاوانە، پیاوان جیهان لەروانگەی خۆیانەوە وەسفدەکەن و ئەو وەسفەی جیهانیان لەگەڵ حەقیقەتی رەهادا لێتێکدەچێت) (جنس دوم، ص١٦١). دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە بۆڤوار دەڵێت: (حەقیقەتی رەها) لەڕاستیدا ئەو نکۆڵیی لەدەسەڵاتی ناونان ناکات کە چیرۆکی راستەقینە دەربارەی جیهان دەهێنێتە ئاراوە، بەڵکو بۆڤوار نکۆڵیی لەوە دەکات کە ئەم چیرۆکانە، چەند چیرۆکێکی لەچاککردن نەهاتووی واقیعێکی لەگۆڕان نەهاتووبن. ئەم چیرۆکانە راستەقینەن، لەبەرئەوەی دەست بۆ خولقاندن و داهێنانی واقیع و شتی نوێ دەبەن.

هەروەکو وتمان، نیچە لە (پاکیزەیی ژنانە)دا ئەوەی روونکردەوە کە چۆن رەمزی بوونی سێکسی ژنان، ژنان بەرەو بێدەنگیی دەبات. مەترسی بێدەنگیی، مەترسی لەدەستدانی هەموو شتێکە، ئەگەر ئێمە کار بەو گوتەیەی نیچە بکەین کە لەشۆپنهاوەری وەرگرتووەو تیایدا دەڵێت (هەر ئەو کەسە بە کە هەیت) و روانگەی خۆمان هەبێ، لەم حاڵەتەدا دەتوانین هەموو شتێکمان هەبێت، بێدەنگیی لەترسەوە سەرچاوە دەگرێ. ترس لەئازار، ترس لەمردن، بەرای نیچە بێدەنگیی ژنان بەهۆی ترسەوەیە لەپیاو. (هەتا ئێستا ترس لەپیاو بەباشی ژنانی لەرەگ وریشەوە تاساندوەو جڵەوی کردون) (فراسوی خیروشر ص٢٣٢) کەواتە ژن دەبێ ئەو بێدەنگییەی خۆی بشکێنێ، دەبێ باسی ئەزمونە تایبەتییەکانی خۆی و خواست و ویستەکانی خۆی بکات، ژن دەبێ دەسەڵاتی ناونان بەدەستبێنێ بۆ ئەوەی لەو رێگەیەوە بتوانێ رەگەز و پیاوسالاریی و زەبوونیی ژنان و زۆر لەم وتەزایانە نەك وەکو پێوەری ئاسایی و پەسەندکراو، بەڵکو وەکو چەند شتێ لەبەرچاو بگرێ کە لەرێگەی ئەو دەسەڵاتەوە واتە دەسەڵاتی ناونان، دروستبوون، هەروەها بەشێوەیەکی جیاوازو بەئاراستەی خوڵقاندنی واقیعێکی ناسێکسی تازە زمان و دەسەڵاتی قسەکردن بەکاربێنێ، هەروەها لەم بارەیەوە، نیچە خۆشی ئەوەمان بیردەخاتەوە کە (تەنها لەپلە وپایەی خوڵقێنەردا دەتوانین شتێك لەناوبەرین: هەڵبەتە نابێ ئەوەش فەرامۆشبکەین کە تەنها بەداهێنانی ناوی نوێ و هەڵسەنگاندن و ئەگەرە تازەکان دەتوانین بەرەبەرە شتی تازە بخوڵقێنین) (دانش شاد، ص٥٨).

******

لەبیری نیچەدا هێشتا زۆر لایەن هەیە کە کاری لەبیری فیمینیستی هاوچەرخ کردووەو ئێمە تەنها ئاماژەمان بۆ هەندێکیان کردووە، نیچە تیۆریستێکی گەورەیە و لەم رووەوە بەلای فیمینیستەکانەوە گرنگە، وێرای دژایەتی ژن لەلایەن نیچەوەو بوغزاندنی فیمینیزم و رەخنەگرتن لەئاکاری کۆیلایەتی، رەخنەکانی نیچە زۆر زوو گوێگرێکی زۆری بەلای خۆیدا بەکێشکرد و لەنێو هەموو ئەوانەشدا، زۆربەیان ژن و چینی کرێکارن، راستە کە رەخنەی نیچە لەلیبرالیزم و یەکسانیخوازیی ئەوی لای زۆر لەو فیمینیستە ئەمریکایی و بەریتانیانە وەدەرنا کە ئامانجی سیاسی و ئابوریيان هەیە و زیاتر جەخت لەبنەمای سیاسی دەکەنەوە بۆ ئازادیی ژنان، بەڵام بیروبۆچوونەکانی نیچە دەربارەی رەگەز و چاکەکاریی و رەخنەگرتنی لەدۆگماتیزم و بیری دەستەبژێریی رۆحانیی نیچەی لای زۆربەی

ژنان کردووە بەرێنیشاندەرو خۆشەویستی کردوە.
نیچە رەخنەی لەرێبازی عەقڵانیی خۆرئاواو ئەو کلتورە گرت کە تاکو ماوەیەکی دورودرێژ فەلسەفەی کردبووە مەداری خۆی و وەکو زۆربەی فیمینیستەکان زۆر لەدۆگماتیزمە فەلسەفییەکان رەتدەکاتەوە. نیچە ئەو بیروبۆچوونانەی کە دەربارەی دەسەڵات بوو هاوشانی متمانەپێکردن، بەتێروانینی نوێ لەفەلسەفەدا، واتە بەرەخنەی کلتوری جینالۆجیا و سایکۆلۆجیا خستەروو، نیچە باوەری بەخواستی دەسەڵات و متمانەکەی هەیە لەقەڵەمرەوی نا سیاسی رێك لەبەر هەمان هۆ رەخنە لەپیاوسالاریی و باوکسالاریی دەگرێ و لەم رووەوەیە کە فەلسەفەکەی نیچە بۆ زۆر لەفەیلەسوفە پیاوسالارەکان بیزارکەرە. نیچە ئەوە نیشاندەدات کە باوکسالاریی لەبەرئەوە متمانەی خۆی بەدەستناهێنێ کە متمانەکەی راستە، بەڵکو حکومەتی پیاوسالار بەهۆی ئەو دەسەڵاتەوە کە هەیەتی و لەراستیدا لەرێگەی زۆر و سەرکوتکردنەوە متمانەی خۆی بەدەستدەهێنێ. لێرەدا چەمکی خواستی دەسەڵاتی نیچە، مانایەکی زۆر گرنگ لەخۆی دەگرێ و ئەوەش ئەوەیە کە خواستی دەسەڵات لەلاوازیی ئەوی دی و زاڵبوون بەسەریدا نییە، بەڵکو خواستی دەسەڵات بۆ خۆی زاڵبوونە، ئەم مەسەلەیە بۆ خۆی گوزارشت لەوە دەکات کە زۆر شایستەتربوو ئەگەر بایەخمان بەرەخنەگرتنی نیچە لەپیاوسالاریی و متمانەی باوکسالاریی بدایە. لەم رووەوە، باسی دەسەڵات و خواستی دەسەڵات لەبیری نیچەدا بەلای فیمینیستەکانەوە زۆر گرنگ و بنەرەتییە، مەبەستی نیچە لەدەسەڵات و ئەو دەسەڵاتە نییە، کە حکومەتی پیاوسالار لەزۆر شوێنی بوارەکانی ژیاندا پیادەیکردووە بەڵکو خواستی دەسەڵات چەمکێکی بالاتر و فراوانترە.
نیچە بەبایەخدانە تایبەتییەکەی بەچەمکی تۆڵەسەندنەوە رێگە بۆ فەیلەسوفە فیمینیستەکان ئاوالا دەکات، ئەو رێگەیەی کە تیایدا ئەوە نیشان بدەن کە تاکو ئێستا تۆڵەسەندنەوەی پیاوان، ژنانی سەرکوتکردووەو هەمان ئەم شیکردنەوەیەی سەبارەت بەتۆڵەکردنەوە لای فەیلەسوفە فیمینیستەکان بۆ تێگەیشتنی ئەوەی هەتا ئێستا لەدژی ژنان وتویەتی و کاری پێکراوە، زۆر گرنگیی پەیدا دەکات.
نیچە لەرەخنەگرتن لەئارمانی دورەپەرێزیدا، ئارمانێکی مەبەستە کە بەئاراستەی سوککردن و بێبەهاکردنی ژیان بەرەوپێشەوە دەچێ و لەم رێگەیەوە جیهانی ماددیی بێبەها دەکات. نیچە ئەم دنیایە بەهۆ (وەسیلە)یەك

بۆ گەیشتن بەجیهانێکی جاویدانە و رۆحیی لەبەرچاودەگرێ و ئەوە نیشاندەدات کە چۆن لەهەمان ئارمان رێگە بەقەشە و فەیلەسوفەکان دەدات بۆ بەسەر جیهانی ماددیی و نا رۆحیدا زاڵبن و هەمان مەسەلە رێگەیەکی زۆری بۆ رەخنەی فیمینیستی فەراهەمکردوە، هەروەها رەتکردنەوەی دوالیزم و گشت جۆرە رووبەرووبوونەوەیەك و باوەڕ نەبوون بەناکۆکیی بەهاکان، یەکێکی ترە لەو ئەنجامە بەکەڵکانەی کە فەلسەفەکەی نیچە بۆ ئەو فەیلەسوفانەی فەراهەمکردوە، کە دەربارەی ژن و مەسەلە تایبەتییەکانی ژن توێژینەوە دەکەن.

سەرچاوە:-گۆڤاری- نامە فرهنگ شمارە ٤٣ لاپەڕە ٨٩-١٠١

# پێگەی
# (سوپرمان، ئافرەت، نەتەوە)
# لەئایدیای نیچەدا

**د. مستەفا غالب**
**لەعەرەبییەوە: لوقمان رەئوف**

نیچە یەکێکە لەفەیلەسوفەکانی سەدەی نۆزدەو لە(١٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٤٤ لەشارۆچکەی (ریکن) نزیك (لیبتسج) لەدایکبووە، رۆژی لەدایکبوونی هاوکاتە لەگەڵ رۆژی جەژنی (البروسا) حاکم (فریدریك غلیوم) ی چوارەم، ئەم بۆنەش دڵی باوکی زۆرخۆشکرد، چونکە ژمارەیەکی زۆری لەئەندامانی خێزانی مەلیکی بەخێوکردبوو، باوکیشی ناوی ئەم کورە نوێیەی ناونا (فریدریك) واتە ناوی مەلیك، نیچە لەمبارەوە دەڵێ: (لەهەموو حاڵەتەکاندا هەڵبژاردنی ئەم رۆژە بۆلەدایکبوونم، یەك سودی هەیە رۆژی لەدایکبوونم درێژترین رۆژی منداڵیمە، رۆژی تێکەڵبوونە لەگەڵ گەلەکەم)

زۆربەی بنەماڵەی نیچە لەپیاوانی ئاینی بوون، بۆیە ئاین رۆڵێکی زۆری گێرا لەمنداڵیدا، بەڵام دواتر ناوی خۆی نا(دوژمنی مەسیح) و بەدرێژایی ژیانی رووبەرووی ئاین بوویەوەو رەخنەی زۆری لێگرت.

نیچە لەتەمەنی (٥) ساڵیدا باوکی دەمرێت، بۆیە شێوەیەکی ئەفسانەیی بۆ باوکی دەکێشێ، دوای مردنی باوکی لەبارودۆخێکی ژنانەی پەتیدا ژیانی بردەسەر، چونکە خێزانەکەی ودەوروبەری هەر ژن بوون دواتر خوشکەکەی



(ئەلیزابات) دەیباتە لای خۆی وبۆماوەی (١٢) ساڵ لەلای دەمێننەوە، لەساڵی ١٨٥٨ چۆتە خوێندنگەی (بفورتا) دواتر چووەتە زانکۆی (بۆن) بۆماوەی شەش ساڵ لەوێبووە، پاش رۆیشتنی مامۆستا زمانەوانیەکەی (رێشل) بۆ لیبتسج، نیچەش دەچێت بۆئەوێ، نیچە یەکەم کتێبی لەساڵی ١٨٧٢ دا بەناوی (مولە المأسامن روح الموسیقا) بڵاوکردەوە لەدوا دواییەکانی ژیانیشیدا شێت دەبێت ولە٢٥ ئابی ١٩٠٠کۆچی دوایی دەکات.

بەگشتی ئەو کتێبانەی کەبە درێژایی تەمەنی نوسیونی بریتین لە:

((لەدایکبوونی تراژیدیا لەرۆحی مۆسیقادا، ئەندێشەیەك بەدەر لەکاتی خۆی ، کاروباری مرۆیی (١٨٧٦-١٨٧٩)، شەفەق (١٨٨٢)، زانستی کۆمیدی، زەرادەشت وای وت (١٨٨٣-١٨٨٥)، جیاواز لەچاکەو خراپە ١٨٨٥ بنچینەی سەرهەڵدانی ئاکار (١٨٨٧)، ئیرادەی هێز (١٨٨٤-١٨٨٥)، لەناوچوونی بتەکان، دوژمنی مەسیح، فەلسەفەی ڤاگنەر، نیچە دژی ڤاگنەر، ئەوە ئەو پیاوەبوو)).

فەلسەفەی نیچە بەشێکی دانەبراوە وئاوێتەی ژیانی بووە، بەشێوەیەك لەقوڵاییەکانی دانابیدا شۆڕبووەتەوە، لەم پێناوەدا فەلسەفەی دەربارەی کیان وبوونی تەواو هەبووە، بیروڕا وتیۆرەکانی لەقوڵاییەکانی وروژانە دەرونیەکان وبوونی کەسیەوە سەرچاوەی گرتوە، وەکو تیۆرێك رووبەرووی هەموو ئەو بیروکارانە بووەتەوە، کەلەناخیدا پەنگیان خواردووەو بەزەینی داهێنەرانەی زیندوی کردونەتەوەو لەجێگەی واقیعی راستەوخۆی ژیانی زیندوی خەڵکی داینوان، نیچە رەخنەی گاڵتەجاریانەی بەرامبەر بیروراو تیۆرەکانی زاناکان هەبوو، جەختی لەوەکردووەتەوە کەنزمترین پلەی مرۆڤ شێوە تیۆریەکەیەتی وبانگەشەی دوورکەوتنەوەی لەسیستمی فیکری کردوە وهەوڵی نوێکردنەوەو پەرەپێدانی داوە.

نیچە خاوەنی پەیامێکی شارستانی بووە بۆژیان، کەپەیامی فەیلەسوفێکی دانای خاوەن پەیرەوێکی تیۆری نەبوو، بەڵکو پەیامی رەخنەگرێك وبەتوانای ئەو شارستانیەتەی کەتیایدا ژیاوە، لەگەڵ هەموو ئەو سیفەتانەی کەتێروانینەکەی بۆشارستانیەتی ئەوروپی هاوچەرخ، لەرووی قوڵی وتوانای رۆچوون بۆدورترین قوڵایی لەخۆگرتوە، کەچی رۆڵەیەکی دڵسۆز بووە بۆشارستانیەتێك کەتەواو نەبووبوو. نیچە بەرهەمێکی رەسەنی سەدەی نۆزدەیە ولەتوانایدا نەبوو حوکمێکی وردی گشتگیر، بەسەر شارستانیەتی رۆژئاوای هاوچەرخیدا بدات، لەبەرهۆیەکی

ڕوون ئەویش ئەوەیە، ئەو شارستانیەتە بەماوەی گواستنەوەدا، بۆسەردەمێکی نوێ تێدەپەڕێ، کەرەگەزەکانی هێشتا تەواونەکرابوون، بگرە هەندێکیان هەر سەریان هەڵنەدابوو. لەسەدەی (١٩)دا شێوازی فیکری لەمەیدانی فەلسەفەی شارستانیدا، شێوازێکی خەمۆکیانەی هەبووە، شێوەیەك کەبانگەشەی تاکرەوی ونەتەوەی تەسك...هتد بکەن، ئەمەش بەهۆی گواستنەوەی جیهانی ڕۆژئاوایی، لەژیانێکی کۆنەوە بۆژیانێکی نوێ، نیچەش، یەکێك بوو لەوفەیلەسوفە بیرمەندانە، بیرکردنەوەی نیچە دابەش دەکرێت بەسەر سێ قۆناغدا:

١-قۆناغی هونەری ڕۆمانتیکی کەلەساڵی ١٨٦٩ دەست پێدەکات تاساڵی ١٨٧٦، ئەو قۆناغەیە، کە کەوتبووە ژێر کاریگەری شۆپنهاوەر و ڤاگنەر، بەوازلێهێنانیان کۆتایی دێت.

٢-قۆناغی شێوازو هەلومەرجی ڕەخنەیی لەساڵی ١٨٧٦ دەست پێدەکات، تاوەکو ساڵی ١٨٨٢، بیرکردنەوەی نیچە بەکاریگەربوون بەپرۆگرامی زانستی چردەبێتەوە، دوای وازهێنان لەکاریگەریە ڕۆمانسیەکانی ڕابردو، ئەو قۆناغەیە کەنیچە سوربوو لەسەرئەوەی کەتوندترین ڕەخنە ڕووبەڕووی خاسیەتەکانی ژیانی مرۆیی بکاتەوە لەسەدەی نوێدا.

٣-قۆناغی سۆڤیەتی پەتی، بەنوسینی کتێبی (زرادشت) دەست پێدەکات لەساڵی ١٨٨٣،تاساڵی ١٨٨٨، بەردەوام دەبێت، تێیدا بیرکردنەوەی لەسەربەخۆیی تەواو ورد دەبێتەوەو لەرێگەیەکی تایبەتدا گوزەردەکات، شێوازەکەشی شێوەیەکی هەڵچوونی سۆفی وەرگرتوە، نەك شیکاری ڕەخنەیی.

لەم سەردەمانەشدا نیچە بەرەو ئاراستەیەکی گشتی، کەئاراستەی مەعقولیەتی داماڵراوە، پەیوەستە بەسروشت وژیانی سەرزەویەوە.

## نیچە و سوپرمان

نیچە پێیوایە ئاکار لەسادەیی ولاوازیدا نیە، بەڵکو لەپشت هێزەوەیە، هەربۆیە دەبێت هەوڵی مرۆیی بۆپەرەپێدانی تاکی بەهێزتر بەکاربهێنرێت، لەبەرئەوەی ڕەگەزی مرۆیی، یان سوپرمان، تەنها ئامانجە بۆبەرزبوونەوەی هەموان، بەرەو ئاستی نمونەیی وتەواوی ڕەها. مرۆڤی عاقڵیش خۆی بریار بدات، لەمەڕ ئامانجەکانی باشترکردنی ڕەگەزی مرۆیی، چونکە لای نیچە ڕەگەزی مرۆیی، نەك تەنها چالاك نابێت، بەڵکو بوونیشی نیەو لەشارەمێرووله دەچێت، یاخود

کاریگەریەتی ئەزمونی گەورەیە کەهەندێ شت تیایدا پێشدەکەوێت، کەچی زۆربەیان تێکدەچن.

گومانی تێدانییە، ئامانجی هەموو تاقیکردنەوەکان لەبەختەوەری جەماوەردانییە، بەڵکو لەچاکسازی نمونەکەدایە، ئەگەر کۆمەڵگەکانیش لەسەریان بێت، کۆتاییەکانیان لەوەباشتر دەبێت، کەگرنگی بەنمونەکە بدرێ، چونکە کۆمەڵگا ئامرازێکە بۆ زیادکردنی هێزو باڵابوونی کەسیەتی تاکەکان، هەروەها کۆمەڵیش لەخۆیدا مەبەست نییە، کەواتە ئامێرەکان بۆ چ مەبەستێکن، ئەگەر سودی تاکەکان تەنها لەچاکسازییاندا بێت؟ ئایا ئامێرەکان، یان رێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان لەخۆیاندا مەبەستن؟ ئایا ئەمە کۆمیدیای مرۆییە؟ پێ دەچێت نیچە لەوتارەکەیدا، باس لەدروستبوونی جۆرێکی نوێ، مرۆڤی تاك وسەرکەوتو و باڵابکات، کەشێوەیەکی خەمناك لەنێو توندوتیژی مرۆڤە ئاساییەکاندا وبوونی ئەو جۆرە مرۆڤە، ئیدانەی دروستبوونی مەبەست وپەروەردەی مەبەستدارو بەخێوکردنی وریابکات، زیاتر لەئیدانەکردنی هەڵبژاردنی سروشتی.

نیچە پێیوایە سوپرمان دەتوانێت، تەنها لەرێگەی هەڵبژاردنی مرۆیی وچاوساغی پەیدابوونی نەوەکان وپەروەردەی باڵاوە بمێنێتەوە، کەواتە نادانیە، گەر رێگەبدەیت بەهاوسەربوون لەرێگەی خۆشەویستیەوە، وەکو رێگەدان بەهاوسەربوونی پاڵەوانەکان لەگەڵ خزمەتکارەکانیدا، هەروەها نیچە بۆی دەرکەوتوە کەشۆپنهاوەر کەوتۆتە هەڵەوە، چونکە خۆشەویستی، کاری نەوە پەیداکردن نییە، کاتێ مرۆڤ عاشق دەبێت، نابێت چەند بریارێك بدات، کەکاریگەری لەسەر هەموو ژیانی هەبێت، چونکە سروشت رێگەی بەمرۆڤ نەداوە، لەیەك کاتدا عاشق ودانابێت، هەربۆیە لەسەرمانە، کەپەیماننامەکانی عاشقەکان روونبکەینەوەو خۆشەویستی بەرێگر لەبەردەم بەهاوسەربووندا دابنێین وچاکتروایە هەرە چاکەکان هاوسەری پێکەوە بنێین وخۆشەویستی بۆگێلەکان دابنێین، چونکە بەهاوسەربوون تەنها بۆزاین نییە، بەڵکو چاکترکردن وپەرەپێدانیشە.

لەبەرئەمەش نیچە دەڵێ: تۆ لاوێکی و حەز لەژنهێنان دەکەیت ومنداڵتان هەبێ، بەڵام لێتدەپرسم: ئایا تۆ پیاوێکی هێندە بەجورئەتی، کەئارەزوی ئەوەدەکەیت کەمنداڵتان هەبێ؟ ئایا تۆ بەرکەوتوەکەی ئایا خودو هەستەکان وپیاوەتیەکانت کۆنترۆڵ کردوە؟ یاخود ئەم حەزەت حەزی ئاژەڵێکەو





دەری دەبری؟ یاخود هۆکەی تەنهاییە؟ یاخود پێچەوانەکەی خۆتە؟ چەند حەزمدەکرد کەسەرکەوتن وئازادی تۆ هاندەری ئەم منداڵبوونەت بوایەو لەم پێناوەشدا چەندین نمونەو پەیکەری زیندوت بۆ سەرکەوتن وئازادیەکەش بنیات بنایەو پشتەوەی خودی خۆشت بنیادبنایە، بەڵام پێشتر دەبێت خودی خۆت بەشێوەیەکی دروست، لەروی لەش ودەرونەوە بنیات بنێیت وتەنها خودت لەزیادبووندا نەبێت، بەڵکو هەوڵی بەرزبوونەوە بدرێت. بەهاوسەربوون: لەسەر ئەم شێوازە ئیرادەی دوانە بۆئەو یەك کەسەی، کەلەهەردوکیان دروستترە، هاوسەربوون بەرێزگرتنی ئەوی تردا ئەنێم، هەروەها رێزگرتنە لەوانەش، کەئیرادەی لەم جۆرەیان هەیە، مەردایەتی بەچەمکی نیچە بەبێ لەدایکبوونی چاك نابێت، چونکە زەین بەتەنها چاك نابێت، بەڵکو هەمیشە شتێکی ترچاکی دەکات، ئەو شتەش خوێنە، دوای ئەوەی ئەوکەسە سوپرمانە، لەدایکبوونێکی چاك پەروەردەیەکی نەوەگیری دەبێت، دەخرێتە قوتابخانەیەکی توندوتیژەوە، بۆ ئەوەی تیایدا کەسێکی تەواو دەربچێت ولەهەمان کاتدا حەسانەوەو چەندین لێپرسراویەتی تیابێت، کەتیایدا لەش فێری ئازاربکرێت، بەهێمنی ئیرادەش لەسەر گوێرایەڵی وفەرماندانەکان رابهێنرێ و ئازادی تیایدا پێشێل نەکرێ ولەش وئاکاری مرۆڤ پێشێل نەکرێ، ئەم قوتابخانەیە دەبێتە فێرگەیەك بۆفێربوونی پێکەنین لەقولایی ناخ ودڵەوەو دەبێت فەیلەسوفەکانیش پۆلێن بکرێت، بەپێی توانای پێکەنینیان وئەوەی بەسەر شاخەکاندا تێدەپەرێت، لەگەڵ هەموو کارەساتەکاندا پێدەکەنێت، بەم شێوەیە تاڵ ئاکاری لەم پەروەردەیەدا نابێت وئیرادەیەکی پاك پەیدادەبێت وئیدانەی جەستەی تیاناکرێت، تەنانەت سوپرمان بۆی هەیە چێژ لەکیژە جوانەکانیش ببینێت. مرۆڤێك کەئەمە لەدایکبوونی بێت لەپاڵ پەروەردەکەیدا، دەکەوێتە پشتەوەی چاکەو خراپەوە، گەربیەوێت دەبێ بەخراپەکار، لەم رووەشەوە بێترستر دەبێت، لەوەی چاکە بێت.

چاکە چییە؟ ئەگەر ئازابێت، ئەوە چاکەیەو هەموو شتێکیش، کەهەست بەهێزبکات چاکە، واتە هێز لەخوددا.

خراپە چییە؟ هەموو شتێك کە لەلاوازییەوە سەرهەڵبدات. سروشتی جیاوازی سوپرمان خۆشەویستی مەترسی وململانێیە، بەمەرجێ مەبەستداربن، چونکە سوپرمان داوای سەلامەتی و رزگاربوون ناکات، بەڵکو بەختەوەری

بۆهەموان دابینده‌کات. زەرادەشتیش هەموو ئەمانەی دەویست، لەم رووەشەوە شوێنی دووری دەبری و بەبێ مەترسی نەدەژیا، لەبەرئەوە هەموو جەنگێك چاکەیە، هەرچەندە هۆکارە گشتیەکان لەزەمەنە نوێکاندا، بێبایەخ بن وجەنگی چاك لەهەموو جەنگێك چاکەیە، هۆیەك پیرۆزترە، تەنانەت شۆرشیش چاکەیە، چونکە زەمەنی ململانێکان گەورەیی پەنگ خواردوی تاکەکان دەردەخات، کەپێشتر زەمەن ودەرفەتی تەواویان بۆی نەبووە ولەم ژاوەژاوەی شۆرشەشدا، پیاوی مەزن دەردەکەون، بۆنمونە لەشۆرشی فەرەنسیدا، ناپلیۆن دەرکەوت، هەروەکو لەسەردەمی رێنسانسدا چەندین کەسایەتی مەزن دەرەتن، زیندەیی وعەقڵ ونەفس بەرزی سوپرمان دروست دەکەن، بەڵام دەبێ بگونجێت، چونکە هەڵچونەکان، تەنها دەبن بەهێز، گەر مەبەستێك لەپشت یەکخستنیانەوە بێت، ئەو مەبەستە لەشڵەژانی حەزەکاندا، دەبن بەهێزی کەسێتی، کەسی لاوازیش ئەوەیە، کەهێزی رەتکردنەوەی نییەو شازەو ناتوانێت بڵێت نا. مرۆڤ گەرهەوڵی پاککردنەوەی خودو رێکخستنی بێت، ئەمە بەرزترین کارە مرۆڤ مەبەستی بێت توندبێ لەسەر ئەوانی تر، دەبێ پێشتر بەرامبەر بەخۆی توندبێت وهەرگیز خیانەت لەهاورێکەی نەکات، ئەمەش سیفەتە کۆتاییەکانی مەردایەتیەو یاسای یەکەمی سوپرمانن، ئێمە کەلە سایەی کەسێکی وەهادابین، ئەتوانین بە بەختەوەری بژین وئامانجمان خۆشویستنی یەکتریە، دەبا گەورەبین وخزمەتی گەورەبکەین، ئەوە چەند دیمەنێکی جوانە، هەموو ئەو ملیۆنە مرۆڤانە لەخزمەتی ناپلیۆن دابوون، گەرهەوڵ بدەین ببین بەپێغەمبەر ناتوانین، بەڵام دەتوانین رێگە بۆهاتنی خۆش بکەین ودەتوانین بەیەکەوە کاری بۆبکەین، بەجیاوازی شوێن وکاتەکان.

زەرادەشت تەنانەت لەئازارەکانیشیدا گۆرانی دەوت وگەربتوانێت گوێ لەدەنگی یاریدەدەرانی دەگرێت، ئەوانەی حەز بە مرۆڤی باڵادەکەن. ئێوەش ئەی مرۆڤە تاکەکان کەلەم سەردەمەدا یەکگرتون، رۆژێك دێت دەبن بەگەل وگەلێکی هەڵبژێراو، لەم گەلەش سوپرمان لەدایك دەبێت.

## نیچە و ئافرەت

نیچە بەوتە بەناوبانگەکەی: (ئایا تۆدەچیت بۆلای ئافرەت؟ کەواتە ئامێری سزاکەت لەبیرنەچێت! ) هێرشی توند دەکاتە سەرئافرەت، بەڵام پێش ئەوەی هۆی ئەمە روون بکەینەوە، چاکتروایە چۆنیەتی پەیوەندی ئەم فەیلەسوفە

بەئافرەتانەوە کەناسیونی روونبکەینەوە، لەپێناو تیشك خستنە سەرهۆکان گومانی تێدانییە پەیوەندی نیچە بەئافرەتەوە دیاریکراوبووە، تاگەیشتۆتە پلەی پێگەیشتن، بەڵام لەمنداڵیدا لەنێوان خێزانێکدا ژیاوە کەلەئافرەتان پێکهاتوە، وەکو دایکی وخوشکی ونەنکی ودوو پوری کەشویان نەکردبوو، هەرگیز بێخەم نەبوو. پەیوەندی بەهێزی بەخێزانەوە نەبوو. نیچە خاتو (لوسالومی) ناسیوە، بەوەی کەگەورەترین وزیرەکترین ئافرەتی سەرزەویە، کاتێك کەداوای کرد شوی پێبکات، دوای خۆشەویستیەکی گەورە، دەرکەوت کەئەم خۆشەویستیە لەیەك لاوە بووەو خاتوو (لوسالومی) ئەم داوایەی رەتکردەوەو شوی بەهاورێکەی کرد، کەناوی (باول ری)ە، نیچە پێیوابوو خاتوو (لوسالومی) خیانەتی لێکردوە، ئەمیش شۆکێکی بەهێزبوو بۆی ولەناخەوە هەژاند وپاڵی پێوەنا، کەخۆی بکوژێ، بەهۆی خواردنی هەندێك حەبی خەو، جگە لەوەش پەیوەندی ترهەبوو، ئەویش پەیوەندی نیچەیە بەکۆزیمای خێزانی ڤاگنەرەوە، کەئەم ئافرەتە پایەیەکی بەرزی لەدڵی نیچەدا داگیرکردبوو، بەهۆی زیرەکی وکارامەیی وجورئەتی بێوێنەیەوە کەپاڵی پێوەدەنا، سەرکێشی لەگەڵ هەموو نەریتەکاندا بکات، نیچە خۆشیویست بەهێمنی وقوڵی، تائەو رۆژەی کەنیچە هەموو پایەکانی زەینی لەدەست نەدابوو ئەمەشی ئاشکرانەکردوە، کەدواتر لەرێگەی تایبەتی خۆیەوە ئاشکرای کرد، ئەمەش رۆڵێکی گەورەی خۆی بینی لەزەین وبیرکردنەوەی هۆشیارانەدا، بەدرێژایی ژیانی نیچە.

لەراستیدا ئەم شکست خواردنەی نیچە لەپەیوندیەکانی لەگەڵ ئافرەتاندا، هۆکارە راستەوخۆکانی هێرشەکانیەتی بۆسەر ئافرەتان، بەوەی بوونەوەرێکی کەم وخەوشدارەو نابێت متمانەی پێبکەین.

ئافرەت بەرای نیچە گرنگی بەکەسەکان دەدات، نەك بەشتەکان، گەر گرنگیش بەشتەکان بدات، ئەوە وەکو کەسەکان دەبێت وتێروانینی کەسی لایەنگرانەی دەبێت، هەربۆیە مەترسیدارە، گەر کاروباری گرنگی بدرێتە دەست، وەك سیاسەت، چونکە هەڵسوکەوتی پاك وبێ لایەنی نابێت.

نیچە رووبەرووی بزاڤی رزگاربوونی ئافرەت، بەهۆی توانا بیریەکانیەوە دەبێتەوە، پێیوایە سروشتی ئافرەت رێگرە لەم بزاڤەدا، چونکە سروشتێکی ئاشتیانەی هەیە، کەرێز لەدەسەڵاتی باو و بیرەکانی ناو کۆمەڵگە دەگرێ ولەتوانایدا نییە بەرەکانیان بکات، هەربۆیە لێرەدا پەیوەست دەبێت بەپیاوەوەو ئەمەش رێگردەبێت لەهەنگاونانی بەرەو رزگاربوونی خۆی، نیچە جەخت لەسەر

ئەوە دەکاتەوە، کەگیانی ئازادو سەربەست، هەرگیز لەگەڵ ئافرەتدا ناژی، بەڵکو بەتەنها دەبێ وبەپێی هەڵسوکەوتی خۆی دەڕوات. گەورەترین پلەش کەئافرەت بیگاتێ، پایەی شتە خاوەندارییەکانە، بەڵام پیاو بەڕای نیچە ڕۆحی، یان گیانی لەقوڵاییدایە، هەروەکو ئارەزوەکانی، تەنها لەسەر شێوازی ڕۆژهەڵاتی بیرلەئافرەت دەکاتەوە، واتە شتێکە کەدەکرێ خاوەنی بیت وکاڵایەکی پۆشراوەو لەسەری نوسراوە لەکاری ماڵەوە خزمەت بکات وخودی خۆی تیادا دروست بکات. ئاشکرایە فاکتەری کەسی هاوکار بووە لەگەڵاڵە بوونی بیروراکانی نیچەدا، هەڵسەنگاندنی بۆئەو کەسایەتیە ئافرەتانەی پێشوو، وەکو لوسالۆمی و کوزیما، ئەوە دەردەخەن کەلەناخی داو لەقوڵایی خودیدا، ئافرەت بەم شێوەیە نیە، بەڵام ئەم پەیرەوەی دواتری بەکارهێناوە، واتە پاش ئەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەم ئافرەتانەدا شکستی هێناوە، کەواتە ئاشکرایە کەفاکتەری خودی زاڵبووە بەسەر زانیاریە ڕۆشنبیریەکانی نیچەدا، لەبارەی بەستنەوەی واقیعیانەی بەجیهانی دەوروبەرەوە، لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یۆنانی ونمونەی باڵای خۆی، لەبیرۆکەی یۆنانیەکان، دەربارەی ئافرەت وەردەگرێت وئەو شتە بێ وێنانەی یۆنانیەکان، بەدیاردەیەکی دروست وپاك لەقەڵەم دەدات، پێیوایە ئارەزوی پیاوان لەخۆشەویستنی ئافرەتدا، لەسەردەمی یۆنانیەکاندا، بەهۆی زاڵبوونی گیانی پیاوانەدا بوو، بەسەر یۆنانیەکانداو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کەرۆڵی ئافرەت لەسەردەمی یۆنانیەکاندا، هەر بریتی بوو لەدروستکردن، یان لەدایکبونی کوڕی خاوەن جەستەی بەهێز، وەکو باوکیان، ئەویش لاویەتی شارستانیەتی یۆنانی پاراستوە، شارستانیەتی پیاوگەری دورودرێژترە، چونکە تێکەڵکردنی سروشتی سەردەمەکان، والەرۆڵی ئافرەت دەکات، کەتەنها کوڕی بەهێز ببینن وهەموو گەشەسەندنەکانی مرۆیی لەنێوان هەردووسەردەمەکەدا پشتگوێ بخەن. گومانی تێدانیە نیچە هەردوو سیفەتە کۆمەڵایەتیەکان وسیفەتە سروشتیەکان تێکەڵ دەکات وبەقوڵی بیری لەهۆی ئەم خەوشداریەی، کەدیویەتی لەئافرەتاندا، نەکردوەتەوە، پێیوابووە کەئەوە سیفەتێکی سروشتیە تیایانداو ئەوەی بەدی نەکردوە کەئەو کەموکوڕییە، ڕەنگە ئەنجامی فاکتەری کۆمەڵایەتی دیاریکراوبێت، نەك پێکهاتەی سروشتی، ئەم هێرشەی نیچە بۆسەر ئافرەت، بەم شێوە توندە بەلامانەوە سەیرنابێت، کەتیایدا گرنگی بەفاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان نەداوەو ئافرەت، دەخزێنێتە ماڵەوەو ملکەچی وڕوژانەکانی پیاوی دەکات، سروشتیەکە گوشاری چەند سەدەو نەوەش وای لێکردبێت،





کەگیانی پارێزگاریکردن و خزانە ناوماڵەوەی تیادروستکردبێت وبیرلەشکاندنی کۆت وبەندەکانی دەسەڵاتی باوی ناوکۆمەڵگە نەکاتەوە.

### نیچە و نەتەوە

نازیەکان بانگەشەی ئەوەیان کرد، کەنیچە فەیلەسوفێکی رەگەزپەرست بووە بەنەتەوەکەی وریگەی بەشۆڕش وجەنگ داوەو لەپێناو یەکلاییکردنەوەی هەرململانێیەك کەلەنێوان نیشتیمانەکەی وئەوانی تردا روودەدات، ئەمەش لەپێناو سەروەری نیشتیمانەکەی وسەرکەوتنی رەگەزەکەی بەسەر رەگەزەکانی تردا. گەربپرسین، ئایا ئەمە راوبۆچوونی تەواوی نیچەیە؟ پێدەچێت ئەو بانگەشەیەی نازییەکان پێچەوانەی واقیع بن، چونکە نیچە وەکو دەزانرێت پشتگیری لەنەتەوەکەی نەکردوەو رەگەزپەرستیش نەبووە بۆنەتەوەکەی، وەکو فەیلەسوفە نازیەکان بۆی چوون، وبانگەوازیشی بۆشەڕ نەکردوە بۆهەمان ئەو مەبەست وبنیاتانەی کەنازیەکان بۆی چوون.



د.زەکەریا لەم بارەیەوە دەڵێ: لەبارەی نیشتیمان پەروەریەوە، نیچە رەگەزپەرستی بۆئەڵمانیا نەکردوە، وەك لەسەردەمی بسمارکدا بانگەشەی بۆکراوە لەپاڵ هەردوو جەنگ دا.



نیچە لەو ئەڵمانیانە نەبوو کەستایشی رەگەزی ئەڵمانی بکات وگۆرانی بۆگەل وبڵندبوونی بەسەر گەلانی تردا وتبێت، بەڵکو زۆر جار خەوشەکانی رەگەزی ئەڵمانی دەردەخست لەرووی نادیاری وسۆفیگەری وهەژاری لەروونی وئاشکراییداو رۆشنبیری فەرەنسی بەمەزنتر داناوەو کاریگەر بووە بەبیرمەندەکانی ولەسەروی هاووڵاتیانی ئەڵمانیای داناون. نمونەی باڵا لای نیچە تێپەراندنی سنورە تەسکەکانی نەتەوەیەو شانازی بەوەوە کرد لەساتە وەختەکانی بیرکردنەوەی هۆشیاریدا، لەم روەوە دەڵێ: ئەو بنەرەتەی لێوەی هاتوم، بەتوانای کردوم کە بۆدورتر لەئاسۆی ناوچەیی ونیشتیمانی بروانم وکارێکی گران نابێت کەئەوروپیەکی دڵسۆزو چاك بم، بەڵکو نیچە هێرشی دەکردە سەر رەگەزپەرستی نیشتیمانی بەگشتی وبەرهەڵستی بەردەم تێکەڵبوونی گەلانی ئەوروپای وای دادەناو دواتر رەخنەی لێگرتوەو دەڵێ: بەرژەوەندی هەموان–گەلان–لەوەدانییە بایەخ بەم گیانی نەتەوەییە بدەن، وەکو زۆر دەوترێ، بەڵکو لەبەرژەوەندی بنەماڵە دەسەڵاتدارە دیاریکراوەکان وچینە بازرگانی وکۆمەڵایەتیە دیاریکراوەکاندایە. بەم شێوەیە رەگەز پەرستی نیشتیمانی توندڕەو، بەفریودانی بەرژەوەندیەکانی



گەلان دادەنێت وبانگەشە بۆجۆرێك لەگیانی جیهانی دەكات، پێدەچێت دەسەڵاتی گیانی یۆنانی، بەسەر بیركردنەوەیدا بواری بۆسەروەری راگرتنی ئەڵمانی نەهێشتبێتەوە، چونكە هەمیشە خەونی بەلەدایكبوونی شارستانیەتی گریكەوە دەبینی، كەهەموو جیهان بگرێتەوەو سنورە تەسكەكانی نیشتیمانگەری ببەزێنێت، سەبارەت بەرەگەز پەرستی كردن بۆرەگەزی ئاری، ئەمەش هیچ بەڵگەیەكی بۆنییە، بەڵكو شوكردنی خوشكەكەی بەیەكێك لەرەگەزپەرستەكان كەئەویش (بر نارد فورستەر)ە، كارێكی ئازاربەخش بوو بۆ نیچە وپەیوەندیشیان، تاكو كۆتایی دۆستانە نەبوو. راستی بیرورا راستەقینەكانی نیچە، هەرگیز نابن بەپشتگری بۆرەگەزی ئاری، بەڵكو پێیوابووە كەرەگەزی ئەڵمانی لەتێكەڵبووندا بووەو خاوێن نییە لەرەگەزی تر، ئەمەش سروشتی راستی ئەڵمانیەكانە، ئەگەرچی نیچە هێرش زۆری كردوەتەسەر جولەكە، بەڵام ئەوە لەبەرئەوە نەبووە كەلەرەگەزی(سامی)ن، كەخاوەنی سیفەتی دژ بەرەگەزی ئاریە، كەئەڵمانیەكان سەربەئەون، بەڵكو ئەمە هۆكاری جیاوازی هەبووە، هێرشی نیچە بۆسەر جولەكە بۆهۆكاری مێژوویی دێرین دەگەرێتەوەو پەیوەندی بەجولەكەی هاوچەرخی خۆیەوەنییە، بەرای ئەو، جولەكە بنەرەتی مەسیحیەكانەو هەندێ جاریش هەردووكیان بەیەك تەوژم لەقەڵەم دەدات وبەلێپرسراویان دادەنێت وبەرامبەر بەگیانی لاوازی دەسخەرۆكردن داینوان، كەئەمەش بەرای ئەو، دوو سیفەتی ئاین خوازەكانن، هەربۆیە هێرشەكەی نیچە بۆسەر جولەكە درێژەپێدەری هێرشەكەیەتی بۆسەر مەسیحیەكان وبەیەكێك لەبنەرەتەكانی مەسیحیەتی داناوە، ئەمەش دوربووە لەهەموو رەگەزپەرستیەك، چونكە هێرشی كردوەتە سەر مەسیحیە ئەڵمانیەكانیشن، سەبارەت بەجولەكە هاوچەرخەكانی نیچە، خودی نیچە بەسۆز بووە بەرامبەریان وبەرگری لەمەسەلەكەیان كردوەو بەپایە بەرزی داناون.

سەرچاوە: نیچە/ موسوعة فلسفیة/ د.مصطفی غالب

# نیچەو
# پرسی دیموکراسی

**شەین واهل**
**لەئینگلیزیەوە: عەزیز رەئووف**

هەرکەسێك بچوکترین زانیاری لەسەر فیکری نیچە هەبێت هەست بەو حەقیقەتە دەکات کەبۆچوونی نیچە لەسەر دیموکراسی بۆچوونێکی ئاڵۆزبووە زۆر بە رەهایی بیرێکی دژە دیموکراسی(antidemocracy) هەبووە نیچە لەکۆتاییەکانی ژیانیدا زۆر بە راکشاوی قسەی لەسەر دیموکراسی کردوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەڵگری تێگەیشتنەو لەهەمانکاتدا هەڵگری بەدحاڵیبوونە لەلایەکەوە لادانێك هەیە یان خۆپەراندنەوەیەك هەست پێدەکرێ کاتێك نیچە هەڵوێستێکی ئەرستۆکراتی، یاخود هەربەهایەکی لەوجۆرەی هەیەو لەلایەکی ترەوە ئەگەری بەدحاڵی بوون لەسەرفیکری نیچە هەیە کاتێك هەست دەکەین لەبارەی گریکەکان و گرنگی چەمکی(گومان) دواوە بەبۆچوونی من چەمکی دیموکراسی لای نیچە هەڵگری سێ راڤەکردنی سەرەکیە: یەکەمیان من هەوڵ دەدەم لەبارەی گومان ودیموکراتی لای نیچە بدوێم. دووەم من هەوڵ دەدەم کەشفی بیری ئەرستۆکراتێکی نیچەو پرسی گەشەکردنی «منی باڵا «لای تاکەکان راڤەبکەم. خاڵی سێیەم وکۆتایش من هەوڵدەدەم گفتوگۆ بکەم لەبارەی بیرورەخنەو سیاسەتی مەزن ورەخنەی نیچە دژبەسیاسەتی ئایەخ(petty politics)کەئەمەش بابەتێکی رەخنەییەو هەڵگری مشتومرە ئەمەش سیاسەتی ئایەخە کەرقێکی گەورەی لای نیچە دروست دەکات وە لەوانەیە کەسانێك واوێنای بکەن کەبۆچی گرنگی بەشداری کردن لەرقەدیاردەیەکی بێ بایەخە

## گومان و دیموکراسی

پەروەردەی گریك وگوتاری گشتی(public Discourse) هاندەری دروستبوونی گومان بوون. ئەمەش کۆنتێستێکە لەنێوان بیرو رای جیاوازو





فرەدیدگادا نیچە هەستی بەوگومانە کردلای خودی تاکەکان لای تاکەکان ململانێ هەیە لەنێوان پێشبرکێ و پاڵنەرە خودیەکاندا کەئەمەش دەقاو دەق ململانێیەکی تاکگەراییە ئەگەری ململانێ لەخودی تاکەکاندا دەتوانرێ ببێ بەمۆدێلێکی سیاسی ئەمەش ئاسانترین و راسترین دەربرینە بۆئەوەی تەوەقوعی دیموکراسی بکەین بەتایبەت لەسەرەتای دەست پێکردنی فەلسەفەی مۆدێرندا(سەردەمی دیکارت ودواتر کانت) کەتەرکیزی زیاتر لەسەر دوالیزمدە کرا،مرۆڤ و دنیا، عەقڵ وجەستە هتد.. بەتایبەت لەو بۆچونانەدا کەعادەتەن هەڵگری جیاوازی وبەرهەڵستکارییە ئەمەش دیراسەی نیچە بوو لەسەر گەرانەوە بۆگریك وکەشف کردنی چەمکی (جیاوازی) و(ململانێ) بەئاراستەی پێشکەوتن گومان پێشبرکێیەکی لەنێوان بەربەرەکانی ولێهاتوویی کەبەهیچ شێوەیەك بەمانای دژایەتی کردن نایەت، بەڵکو بریتیە لەگەران بەدوای بەختەوەریدا سەرکەوتنی تەواو لەکۆتایی شکستەکاندایە لەکۆتایی گومانەکاندایە لەچرکەساتی ئێستاماندا ئێمە شەری سنورە کێشراوەکان دەبینین لەنێوان لایەنە بەرهەڵستکارەکاندا ئەگەری نێوان (جەنگ)و (گومان)، هەرلایەك نێگەتیڤانە پێناسەی بەرامبەر دەکات وەك بەرهەڵستکارێکی ئەوی دی لەجیاتی پشتگیری کردنی بیرو راکان بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ. لەوانەیە ئەمە رەمزی دیموکراسی بێت کاتێك کەدەبینین (گومان) بەرەو شکست دەچێت، کەئەمەش لێکچونێکە لەنێوان نیچەو ئەفلاتون بەو پێیەی دیموکراسی لەئەنجامدا هەنگاودەنێ بەرەو ستەمکاری(Tyranny) لەهەرئەنجامێکدا رۆحیەتی گومان هەیە کەشۆربوونەوە هەیە بەرەو ژیانی گشتی سەردەم تەنانەت لەفراوانبوونی روکاری لێبووردن(Tolerance) بەرەو جیاوازبوون لەجیاتی بەرهەم هێنانی ململانێ وەك مانایەکی پێشکەوتن ئێمە هەریەك لەجیاوازیەکی کوێرانەو هەرەس بەرەو (رێژەیی) یان دامەزراندنی ئۆپۆزسیۆنی تر دەبینین... ئەمەش وەك دوژمنێك کەشکست دەخوات غەرقی زەوی دەبێت ودەکوژرێت ئەم روحیەتی گومانە وای لێکردوم راستەوخۆ ئیش لەسەرئارەزووە تایبەتیەکانی نیچە بکەم نیچە بەشێوەیەکی گشتی سەربەگروپی نوخبە(ELitist) بوو. وەك جۆرێکی خەڵوەت ئاسا کە گەرانە بەدوای هەڵوێستی مرۆڤانە و وێنەیەك لەراستی، بەڵام لەبەرئەوەی نیچە وێنەیەك بوو بۆ(منی باڵا) لەتاکەکاندا کەئەمەش خۆی لەخۆیدا بوونە بەکۆمەڵایەتی وگەرانەوەیە بۆناو گشت (Public)

مۆدێلی ئەرستۆکراتی و ئارەزووی یەکسانی ئەوانەی دی

وەزیفەی نیچە بانگەشەکردن بوو بۆفەردانیەت لەکۆمەڵگەدا وژیانی خەڵوەت ئاسا بەمەبەستی وازهێنان لە»ژیانی بازار ئاسا«(Marketplace) هەڵهاتن لەقەرەباڵغی کۆمەڵگەو گەڕانەوە بۆتاکگەڕایی (lndividualism) کەسەرجەم نوسینەکانی نیچەدا ڕەنگی داوەتەوە بەجۆرێك کەنیچە بۆ فەیلەسوفی تاکگەرایی ناسراوە. ئەمەش بەشێوەیەك کەنیچە هەمیشە لەبەرەنگاری ناشرینی کۆمەڵگەدا بووە وەکو ئەوەی بیەوێت شەڕی کۆمەڵگە بکات نیچە ئارەزووی یەکسانی دەکرد یەکسانیەك خالی لەفریودانی کۆمەڵایەتی، ئەم ئارەزووەش بۆکۆمەڵگایەکی تەندروست لەگەڵ ئەوانیتر(Others) داجۆرێکی ترە لەلایەنی گرنگ وشاراوە لەئارەزووی نیچە بۆدیموکراسی ئەم بایەخە زیادەڕۆییەی نیچە وەك سەنتەرێك بۆ بەهێزبوون و «باڵا» ی تاکەکان لەزۆرەملێی کۆمەڵگە هەوڵی پێشکەوتنی بواری فکری نیچەیە لەپاڵ هەوڵەکانی تریبدا ئاگایی نیچە دەردەخات بەدڵنیاییەوە بڕوای بەپلەو بایەخی مرۆڤ هەبووە ئەو ئارەزووی بەئایدیای یەکسانی سروشتی( Natural legality ) نەبووە، بەڵکو پێیوابووە هەندێ خەڵك لەهەندێکی ترباشترن، ئەوەش بـــــەمـــــانـــــای ئەوە نایەت

خەڵکانێك لەکاتی لەدایکبوونیانەوە بەسامان وناوبانگ هەڵگری یەك جۆر پلەو بایەخ بوون ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەسیستمی یاسادانان پێویست بێت بۆدیاریکردنی چارەنوسی خەڵك بۆدڵنیابوون لەدەسەڵاتی دامەزراوە یاساییەکان کۆمەڵگە پێویستە شوێنێك بێت بۆبەختەوەری تاك، چونکە هەرکۆمەڵگەیە تاك بەرهەم دێنێ. بەوپێیەی چانسی یەکسانی پێویستی بەیاسای یەکسان و بنەمای ئابوری یەکسان هەیە ئەوانەی لەکۆمەڵگەدا مرۆڤی مەزنن ناکرێ نکوڵیان لێبکرێت «مەبەست لەنوخبەی رۆشنبیر ـ وەرگێر» ئەمە مانای ئەوە نایەت کەجەوهەری رەوشتی کۆمەڵێك لەتاکەکان لەسەروی ئەوانیترەوە بن نەخێر بەڵکو هەندێك خەڵك بەرهەم هێنترن لەوانی دی ئەمەش هەموومان بەرەو بەختەوەربوون رادەکێشێ، ئەمەش بەمانای تەحەداکردن ومۆتێڤ بوونە لەجیاتی لێبووردنی کوێرانە یان ململانێ دژ بە بەهای کەسانی تر



نیچە

## ڕەخنەو سیاسەتی مەزن

لەدەرەوەی ئەوبەرەنگاری وئۆپۆزسیۆنانەدا. لەدەرەوەی ئەو پەراوێزخستن وفەرامۆشکردنانەدا بێگومان کۆمەڵە کەسانێك هەن کە هێزی ڕاستەقینەیان ئامادەیە یان خاوەنی وزەن بۆپێشکەوتن وگۆڕان(Change) نیچە چەمکی «سیاسەتی ئایەخ» ی بەکاردەهێنا وەك ئاماژە کردنێك لەتێڕوانین لەسیاسەتی سەردەم یان بەمانایەکی ترگوشار خستنەسەر مرۆڤە سیاسی ومەسڵحەتچی ودرۆزنەکان یان ئەوانەی سەرگەرمی خەڵەتاندنی تاکەکانن بۆگەیشتن بەدەسەڵات، تەنانەت پەراوێز خستنی دامەزراوەکان کەتەنها تەوەقوعێکە بۆئۆپۆزسیۆن بەرامبەر بەدامەزراوەی نوێ،... بەڵام زۆرینەی خەڵك بەگەمەی دامەزراوەکان خۆدەناسێنن وپرۆتیستۆ دەکەن لەسەر شەقامەکان یان هەر جوڵەیەکی شەخسی ترکەهەڵگری مانایەکی قوڵییە بۆئارەزووی تاکەکان، بەڵکو کاردانەوەیە لەدژی شتێك یاخود دیاردەیەك لەبری سیاسەتی ئایەخ ئایدیایەکی ترمان هەیە ئەویش»سیاسەتی مەزن»ە ئەمەش جۆرێکە لەگەمەی سیاسی لەبەشێك لەو هەڵوێستانە لەدەرەوەی ئەو ستانداردە ئاساییانە و ناساندنە گشتگیرانە بۆ دنیای ئەمرۆ.

خەڵکانێك سەرقاڵ نین بەهیچ بزوتنەوەیەك»Movement« بەڵام پۆزەتیڤانە سەرگەرمی ناساندنی خۆیانن بەهۆی هەڵبژاردن و کارامەیی بەگوێرەی ویست و ئارەزووەکانی خۆیان ئەمەش بنەمای سروشتی ڕەخنەیە، کەسروشتێکی فەرعییە نەك گشتگیر کەبەکارامەیی خۆیان ڕەخنە لەدامەزراوەکان و سیاسەتی ئایەخ دەگرن. لەرۆحی گوماندا خەڵکانێك بەگوێرەی ئارەزووەکانیان لەهەنگاوناندان بەرەو جۆرێك لەبیرورا، کەتاکە ئایندییەکان تەنها دەتوانن چاوی پێ هەڵهێنن، واتە دەتوانن شتێك بکەن کەکارەکتەرە ئایندییەکان تەنها دەتوانن لێی بروانن. لەوانەیە ئەوانە لەو مەخلوقانە بن کەرۆحیەتێکی کارایان هەبێ کائینەکانی سەربەسیاسەتی مەزن کائینێکن لەوانەیە بەجیاواز لەوانەی دی داهێنەربن. ئەوان تەواو لەتاك و کۆمەڵگە گەیشتوون، ئەوانە ئەو مرۆڤانەن کەنیچە ئاواتی دەخواست کەببنە مرۆڤی دیارو بەرچاو لە کۆمەڵگەدا. لەڕاستیدا ئەوانە ئەو مرۆڤانەن کەجیلی مەزن دەخوڵقێنن.

سەرچاوە: ئینتەرنێت

